زنجیرەی پەروەردە و پێگەیاندن
قۆناغی یەکەم
-١-

# پەروەردەی دەروون

چاپی یەکەم
١٤١٨ک ١٩٩٧ز

ئامادەکردنی لیژنەیەکی پسپۆڕ

❁ ناوی کتێب : پەروەردەی دەروون
❁ ئامادەکردنی : لیژنەیەکی پسپۆڕ
❁ چاپی یەکەم _ ١٤١٨ک - ١٩٩٧ز
❁ تیراژ : ٢٠٠٠ دانە
❁ ژمارەی سپاردن ( -263- ) ١٩٩٧
❁ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾

بسم الله الرحمن الرحيم

**إن الحمد لله ؛ نحمده ، ونستعينه ، ونستغفره ، ونعوذ با لله من شرور أنفسنا و سيئات أعمالنا ، من يهده ا لله فلا مضلَّ له ، ومن يضلل فلا هادي له .**

**وأشهد أن لا إله إلا ا لله وحده لا شريك له ، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله .**

﴿ يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولا تموتن إلا وأنتم مسلمون ﴾ آل عمران/١٠٢ .

﴿ يا أيها الناس اتقوا ربكم الذي خلقكم من نفس واحدة وخلق منها زوجها وبثّ منهما رجالاً كثيراً ونساءً واتقوا الله الذي تساءلونَ به والأرحام إن الله كانَ عليكم رقيباً ﴾ النساء/١ .

﴿ يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولاً سديداً . يُصلح لكُم أعمالكُم ويغفر لكُم ذُنوبكُم ومن يطع الله ورسُوله فقد فازَ فوزاً عظيماً ﴾ الأحزاب/ ٧٠-٧١ .

# پێشەکی

ئاشکرایەکە بایەخدان بە زیندوو ڕاگرتنی حاڵـەتی ئیمـانی و، پاککردنـەوەی دڵ و دەروون و، خۆ ڕازاندنــەوە بـە ڕەوشـت و ڕەفتـاری بـەرزو چـاک، هـەنگاوی یەکەمی پەروەردەی ئیسلامی‌یەو، خوای گـەورە فـەلاح و سـەرفرازیی هەرکەسـی بەسـتووە بــە ڕادەی پـەروەردەکردن و گەشـەپێدانی دەروونی‌یــەوە.. هــەروەک دەفەرموێ: ﴿قَد أفلَحَ من زكّاها، وقد خابَ من دَسّاها﴾ .

جا ئەو ئیمانەی کە خوای گەورە دەیەوێ لە دڵەکاندا جێگــیر ببــێ، ئەوەیـە ببێتە هەوێن و بزوێنــەری هـەموو کـارو کردەوەکـان و، کاردانـەوەی ڕاسـتەوخۆو گرنگی هەبێت لە ژیـانی موسڵمانداو، کەسێتیی مرۆڤـی بـاوەڕدار توندوتـۆڵ و بەهێز بکات.

ئەو زنجیرە باسانەی لەم بەرگــەی (**زنجیرەی پەروەردەو پێگەیاندن**)دا هاتوون، بۆ هاتنەدیی ئەو ئامانجە دانراون و، هیواداریـن جێی خۆیان بگرن.

پێویستە لەم پێشەکی‌یەدا ئامــاژەش بـەوە بکـەین کـە لەم زنجـیرە باسـەدا بابەتە سەرەکی‌یەکانی پەروەردەی ئیمانیی دانراون، واتە ئەم باسانە هەڵبژاردەن و، تایبەتی قۆناغێکی سەرەتایی پەروەردەکردنن و، بە پشتیوانی خوا لە زنجیرە داهاتووەکاندا بەشەکانی تری ئەم لایەنەش دەخەینە ڕوو..

هیواداریـن پەروەرشیاران سوود لەم زنجیرەیە وەربگرن و، جێی ڕەزامەندی خواو، سوودمەندیی هەموو دڵسۆزێک بێت .

# ئەو ئیمانەی کە خوا مەبەستیەتی

ڕەنگە زۆرجار بیستبیتمان کە دەڵێن (ئیمان - باوەڕ) چارەسەری کێشەکانی ژیان دەکات، مرۆڤ بنیات دەنێتەوەو خێزان و کۆمەڵگەکان بەرەو بەختەوەری دەبات، ستەم و زۆرلێکردن دەسڕێتەوەو دادپەروەری و خۆشەویستی لەناو خەڵکیدا بڵاو دەکاتەوە.. پاشەڕۆژ و قیامەتی مرۆڤیش ڕۆشن دەکات و لەبەردەم خوای گەورەدا ڕووسووری دەکات .. ئاخۆ مەبەست لەو باوەڕە چی بێت ؟ لە دەروون و ناخی مرۆڤدا چی بەرهەم بهێنێت ؟

بۆ ڕوون بوونەوەی ئەم باسە پێویستە پێناسەیەکی تەواوی ئەم باوەڕە بکرێت و وێنە تەواوەکەی نیشان بدرێت..

باوەڕ تەنها بەوە تەواو نابێت بە دەم بڵێین باوەڕدارین ؛ چونکە زۆرکەس دەتوانن بە زمان بڵێن باوەڕدارین و، بەڵام دڵیان باوەڕی تێدا نەبێت : ﴿ومن الناس من يقول آمنا با لله وباليوم الآخر وما هم بمؤمنين ، يخادعون ا لله والذين آمنوا وما يخدعون إلا أنفسهم وما يشعرون﴾ البقرة/ ٨-٩ . واتە هەندێ کەس هەن دەڵێن باوەڕمان بە خواو ڕۆژی دوایی هێناوە، بەڵام باوەڕدار نین .. - بە خەیاڵی خۆیان - خواو باوەڕداران هەڵدەخەڵەتێنن، لەڕاستیدا خۆیان هەڵدەخەڵەتێنن ، بەڵام هەستی پێ ناکەن.

وە باوەڕ تەنها کۆمەڵە کردارێک و چەند دروشمێک نییە خەڵک وەک خوو نەریتی ڕۆژانە لەسەری ڕاهاتبن ، چونکە زۆر کەس دەتوانن لەڕوکاری دەرەوەیاندا بەباش و جوان دەرکەون و هەندێ کرداری چاک ئەنجام بدەن و دروشمەکانی پەرستن بەجێ بهێنن و لەو کاتەشدا دڵیان وێران بێت و خاڵی بێت لەچاکەو دڵسۆزی بۆ خوای گەورە: ﴿إنّ المنافقين يخادعون ا لله وهو خادعهم ، وإذا قاموا الى الصلاة قاموا كسالى ، يراءون الناس ولا يذكرون ا لله إلاّ قليلاً﴾ النساء/١٤٢.

دووڕوەکان - بەخەیاڵی خۆیان - خوای گەورە هەڵدەخەڵەتێنن ، بەڵام خۆیان دەخەڵەتێنن، کە هەڵدەستن بۆ نوێژ بە تەمەڵی هەڵدەستن بۆی ، ڕونمایی بۆ خەڵک دەکەن بۆر کەم نەبێت یادی خوا ناکەنەوە.. هەروەها باوەڕ تەنها زانستێکی عەقڵی نییە ، زۆر کەس هەن ڕاستییەکانی دەزانن و باوەڕیشیان نییە ﴿وجحدوا بها واستيقنتها أنفسهم ظلماً و علواً﴾ النمل/١٤.. نکوڵیان لێ دەکرد ، هەرچەند دڵنیاش بوون لە ڕاستییەکەی ، ئەمەش بە هۆی ستەم و خۆ بەزل زانینیانەوە بوو .

خۆ بەزل زانین و خۆشەویستی دنیاو ئیرەیی (حسود) بردن وای لێ کردبوون کە باوەڕی تەواویان نەبێت : ﴿وإنّ فريقاً منهم ليكتمون الحق وهم يعلمون﴾ البقرة/١٤٦.. کۆمەڵێکیان هەیە ڕاستییەکانیش دەزانن ، بەڵام دەیشارنەوە .

کەواتە باوەڕ تەنها کاری زمان یا لاشە یابیرو هۆش نییە . بەڵکو لەڕاستیدا کارێکی دەروونییەو بە ناخی مرۆڤدا دەچێتە خوارەوە ، هەموو قەوارەی مرۆڤ دەگرێتەوەو ویست و تواناو لێهاتنەکانی ئاراستە دەکات .

پێویستە لەژیاندا ڕاستییەکانی بوونەوەر وەک خۆیان لەواقیعدا بناسرێن ، ئەم ناسینەش لەڕێگەی سروشی خواییەوە نەبێت بەجێ نایەت . کاتێک ئەم ناسینەش دەبێتە باوەڕ کە دەگاتە

ـاستی دڵنیایی و یەقینی تەواوو هیچ گومـان و دوودڵییـەکی بەرامبـەر دروست نـەبێت : ﴿إنّما المؤمنون الذین آمنوا بالله ورسوله ثمّ لم یرتابوا﴾ الحجرات ١٥ . واتـە : بـاوەڕداران ئەوانـەن کـە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەر هێناوەو گومانیان لا دروست نەبێوە .
تێگەیشتن و زانستی بۆ ئەوەی ببێتە باوەڕ پێویستە ئارام بوونی دڵ و مل کەچ بوون و گوێ ڕایەڵی و فەرمانبەرداری و ڕازی بـوون و خۆبەدەستەوەدانی بـە دوادا بێت بەرامبـەر بـە خـوای گەورە ﴿ فلا وربك لا یؤمنون حتی یحکموك فیما شجر بینهم ، ثم لا یجدوا في أنفسهم حرجا مما قضیت ویسلّموا تسلیماً﴾ النساء/٦٥. واتە: سـوێند بێـت بـە پـەروەردگارت باوەڕەکـەیان تـەواو نـابێت تـا لەناکۆکییەکانی نێوانیاندا نەتکەن بە دادگەر ، پاشـان نـابێت بەرامبـەر فەرمانـەکان لەدڵیـاندا هیچ دروست ببێت و پێویستە بەتەواوی تەسلیمی بڕیارەکانت ببن .
﴿إنّما قول المؤمنین إذا دعوا الی الله ورسوله لیحکم بینهم أن یقولوا سمعنا وأطعنا و أولئك هم المؤمنون﴾ النور /٥١. واتە: هەڵوێستی باوەڕداران وایە، ئەگەر بانگ کران بـۆ فەرمانـەکانی خـواو پێغەمبەر تا دادگەریان بکات ،دەڵێن بیستمان و گوێڕایەڵیش دەکەین ، ئەوانە سـەرفرازو ڕزگـار دەبن لە سزای دونیاو قیامەت . ﴿وما کان لمؤمن ولا مؤمنة إذا قضی الله ورسوله أمراً أن یکون لهم الخیرة من أمرهم﴾ الاحزاب /٣٦ . واتـە : هیـچ بـاوەڕدارێکی پیـاو یـا ژن بـۆی نییـە ئەگـەر خـواو پێغەمبەر فەرمانێکیان براندەوە ئەو ڕای خۆی بهێنێتە پێشەوە .
ئەو زانست و تێگەشتنەی لای مرۆڤ دروست دەبێت ، پێویستە دڵ گـەرمیو ملکەچییـەکی وای بەرامبەر دروست ببێت ببێتە پاڵنەر بۆ کارکردن بە پێی بنەماکانی و ، پەیوەست بـوون بـە داب و نەریت و ئاکارو ڕەوشتەکانییەوە و ، ئەو کاتە دەبێتە باوەڕی تەواو ، هـەر بۆیـە دەبینـین قورئانی پیرۆز بەم شێوەیە وەسفی بـاوەڕداران دەکـات : ﴿إنّما المؤمنون الذین إذا ذکر الله وجلت قلوبهم وإذا تلیت علیهم آیاته زادتهم إیماناً وعلی ربهم یتوکلون . الذین یقیمون الصلاة ومما رزقناهم ینفقون ، أولئك هم المؤمنون حقاً﴾ الانفال /٢-٤ .
باوەڕداران ئەوانەن کە باسی خوا کرا لە لایـان دڵیـان دادەخورپێـت و، ئەگـەر ئایەتـەکانیان بەسەردا خوێندرایەوە باوەڕیان زیاتر دەبێت و پشـت بـە پـەروەردگاری خۆیـان دەبەسـتن، ئەوانـە نوێژەکانیان بەجێ دەهێنـن و لـەو ڕۆژیـەی پێمـان داون لێـی دەبەخشـنەوە، ئەوانـە بـاوەڕداری ڕاستەقینەن..
لە قورئانی پیرۆزدا باوەڕ هەمیشە لە قاڵبی کاری جوان و ڕەوشتی بەرزدا پیشـان دەدرێـت، هەر بەوەش باوەڕداران لە دووڕووەکان جودا دەکرێنەوە.. ﴿قد أفلح المؤمنون الذین هم في صلاتهم خاشعون، والذین هم عن اللغو معرضون، والذین هم للزکاة فاعلون، والذین هم لفروجهم حافظون﴾ المؤمنون.. بەڕاستی باوەڕداران ڕزگاریان دەبێت، ئەوانەی لـە نوێژەکانیـاندا ملکـەچن و، لـە وتـە و ئاکاری زیاد و ناپێویست دوورن و، زەکات دەدەن و، داوێنی خۆیان پاك ڕادەگرن.
خوای گەورە لە وەسفی باوەڕدارە ڕاستەقینەکاندا دەفەرموێت: ﴿إنّما المؤمنون الذین آمنوا بالله ورسوله ثم لم یرتابوا وجاهدوا بأموالهم وأنفسهم في سبیل الله أولئك هم الصادقون﴾ الحجرات/١٥..
باوەڕداران ئەوانەن کە باوەڕیان بە خوا و پێغەمبەر هێناوەو ، گومانیان لا دروسـت نـەبووەو، بـە سەر وماڵیان لە پێناوی خوادا تێکۆشاون، ئەوانە - باوەڕداری- ڕاستگۆن.
(سید قطب) ی شەهید لە (في ظـلال القرآن)دا لـە تەفسـیری ئـەم ئایەتـەدا دەڵێـت: (بـاوەڕ

دڵنیابوونی ڕاستەقینەیە بەرامبەر بە خواو پێغەمبەر، دڵنیابوونێک جێگیرو پتەو بێت و تێکچوون و پەشیمانی و خاوبوونەوە ڕووی تێنەکات و هەست و هۆش و دڵ لێی بێزار نەبن.. ئەو دڵنیابوونەیە کە تێکۆشانی سەرومالیی بۆ خوای گەورە لای خاوەنەکانی دروست دەکات.. ئەگەر دڵ چێژی باوەڕی چەشت و لە ئاستیدا ئارام بوو، دەبێتە پاڵنەرێک بۆی و لە جیهانی واقیعی دەوروبەریدا دەچەسپێت.

مرۆڤی خاوەن باوەڕ دەیەوێت جیهانی دەوروبەری و ژیانی خەڵکی وەک ئەو هەست و هۆشە ناوەکیەیان لێ بێت کە هەستی پێ دەکات، چونکە بوونی جیاوازی لە نێوانیاندا لە هەموو ساتێکدا ئازاری دەدەن و دەیخەنە ژێر پرسیارەوە.. لێرەوەیە کە بانگەشەی تێکۆشانی سەر ومالیی لە پێناوی خوادا لە ناخەوە هەڵدەقوڵێت، بێئەوەی هیچ زۆر لەخۆکردنێکی پێوە دیاربێت. باوەڕدار دەیەوێت ئەو ماناو شێوە پرشنگدارانەی لە دڵیدا هەستیان پێدەکات بێنە ژیانەوەو ڕۆڵی خۆیان ببینن..

ململانێ و بەربەرەکانێ لە نێوان باوەڕدارو باوەڕنەرێتە نەفامییەکاندا لەوێوە سەر هەڵدەدات کە باوەڕدار ناتوانێت دوو ڕووی هەبێت، ناخی شتێک بێت و دەوروبەریشی باسێکیتر پیادە بکەن، لەوکاتەوە دەست پێدەکات کە ناتوانێت لە تێگەیشتنە باوەڕدارییە بالاکانی بێتە خوارەوەو لە پێناوی واقیعێکی لارو چەوتدا وازیان لێ بهێنێت، بێگومان بەرهەڵستکاری لەنێوان نەفامی و مانا باوەڕدارییەکانیدا دروست دەبێت.

ئەو ڕەگەزانەی لە پێشەوە باسمان کردن باوەڕی ڕاستەقینە پێکدەهێنن، بە ونبوون یا دیارنەمانی هەر یەکێکیان ئەو باوەڕە ئەوەندە کەم وکورتی دەهێنێت و لە باوەڕی ڕاست دوور دەکەوێتەوە.. ڕەنگە هەموو ناوەکانی (بیر-فكرة) (بیردۆز-نظرية) (ڕا - رأی) لێبنرێت، بەلام هەرگیز ناونیشانی باوەڕی ڕاستەقینەی بەسەردا ناچەسپێت.

باوەڕی ڕاستەقینە دەبێتە نورو ڕووناکی و، ناخی دڵ و دەروون ڕۆشن دەکاتەوە، گورو تینی پێدەبەخشێت و، دەگاتە قەناعەت و ژیری و، ئارامیی دەداتێ، دەگاتە دڵ دەیخرۆشێنێت، دەگاتە ویست و توانا دەیانبزوێنێت، ئەگەر ژیری قەناعەتی کردو دڵ خرۆشا و ویست و تواناش بزوان؛ ئەندامەکانی لەش دێن بە دەمیانەوە و کردەوە چاکەکان لەدایک دەبن.

مامۆستا (أحمد أمين) لە کتێبی (فيض الخاطر) بەرگی(١)دا چەند جوانە کە دەڵێت: (ئەگەر تۆ تەنها.وەک (رأی) ڕا یەک لە باسێک تێبگەیت، ئەوا دەچێتە خانەی زانست و مەعریفەتەوە، بەلام ئەگەر باوەڕت پێهێنا تێکەڵی خوێنت دەبێت و بە ئێسقان و مۆخدا دەچێتە خوارەوە و قوولایی دڵ دەپێکێت).

خاوەنی ڕاوبۆچوونێک ئەگەر فەیلەسوفێکیش بێت، ڕەنگە ئەمڕۆ ڕاو بۆچوونەکانی ڕاست بن و بەڵگەیان لەسەر هەبێت، بەلام دوورنییە سبەینێ هەڵوەشێتەوەو ناڕاستیی بەڵگکانیش دەرکەون، کەواتە قەناعەت و تێگەیشتنەکانی شایانی گۆڕانی بەردەوامن.. بەلام باوەڕ لەپاش چەسپاندنی بەوجۆرە نامێنێت، دەچێتە خانەی نەگۆڕەوە، ئەمڕۆ و سبەینێ و پاشەڕۆژێکی دووریش هەر ڕاست دەبێت و هەرگیز هەڵە قبوڵ ناکات، بەرزتر دەبێت لەوەی گومان و دوودڵی پێی بوێرن و دەچێتە ڕیزی بەڵگەنەویستەکانەوە.

ئەگەر حاوەن ڕا، ڕاکەی وەرگیرا و جێبەجێ کرا ڕەزامەندیی دەردەبڕێت و دڵخۆش دەبێت، بەڵام ئەگەر وەرنەگیراو ڕەت کرایەوە -سەرەڕای دڵگرانی- ڕەنگە گومانی بەرامبەرێش دروست ببێت و ئەو هەڵپەیەی جارانی نەمێنێت لە گەیاندنیدا، چونکە وەک مرۆڤێک دەگونجێت هەڵە ڕووی تێبکات و ڕاستییەکانی لێ تێکبچن.. بەڵام باوەڕدار هەمیشە گەرم و بەتینە و تا چەسپاندنی باوەڕەکەی نەبینێت ئارام نابێت.

حاوەنی ڕاو تێگەیشتنێکی دیاریکراو ڕەنگە لا بدات یان ڕا بگۆڕێت، بە تایبەتی ئەگەر بەڵگکان خرانە بەردەستی، یا ئەگەر بەرژەوەندییەک هاتە پێشەوە، بەڵام باوەڕداری ڕاستەقینە هەمان هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ دەگرێت کە فەرمووی: ئەگەر ڕۆژ بخەنە لای ڕاستم و مانگ بخەنە لای چەپم تا واز لەم کارە بهێنم، وازی لێ ناهێنم.

بیرو تێگەیشتن لاشەیەکی بێ گیانە، ئەگەر باوەڕ بە ناویدا نەچێتە خوارەوە ئەشکەوتێکە تاریکە تا ڕووناکیی باوەڕی پێدەگات.. بیروڕا بە تەنها گۆمێکی لیلە، بەڵام باوەڕ دەریایەکی بەرفراوانەو لیلی و پیسبوون لە کاری ناخەن.

بیروڕای تەنها تەنگ و چەڵەمە دروست دەکات، بەربەست دەخاتە بەردەم، ملکەچی داواکارییەکانی لاشە دەبێت، گومان بەرهەم دەهێنێت و پاشگەزبوونەوە پەیدا دەکات.. بەڵام باوەڕ هەموو سنوورەکانی مەترسیی دەبڕێت و گۆڕران لە سەردەمەکاندا دەهێنێتە کایەوە و، ڕەوڕەوەی مێژوو هەڵدەگێڕێتەوە و، گومان و دوودڵی دەڕەوێنێتەوە و، بەدەم داواکارییەکانی گیانەوە دەچێت.

# تــه وبــه كـــردن

خوای گەورە دەفەرمویت: (إن الله يحب التوابين ويحب المتطهرين) البقرة/٢٢٢، واتـە: بەڕاستی خوایگەورە تەوبەکارو پاکخوازانی خۆش دەویت، هەروەها دەفەرمویت: (وتوبوا إلى الله جميعاً أيها المؤمنون لعلكم تفلحون) النور/٣١، واتـە: بـاوەڕداران! تێکـڕا بگەڕێنـەوە بـۆ لای پـەروەردگار تـاکو سەرفرازبن، لە ئایەتێکی تردا دەفەرمویت: (ياأيها الذين آمنوا توبوا إلى الله توبة نصوحا) واتـە: ئـەی باوەڕداران! بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان و تەوبەی (نصوح) بکەن .

(ابن كثير) لە پێناسەی (نصوح)دا دەفەرمویت: ( ئەوەیە کە مرۆڤ بـەجۆرێک تەوبـە بکـات کـە تـاوان و گونـاهی لـەلا بێزاربێـت و هـەرکاتێکیش گونـاهو تاوانـەکانی هاتـەوە یـاد داوای لێخۆشبوون بکات).

**پێناسەی تەوبە :**

لە زمانەوانیدا تەوبە واتە: ( گەڕانەوە )و پاشگەزبوونەوە لەشتێک، لـە شـەرعیش دا واتـا: وازهێنان لە گوناهو تاوان و پەشیمان بوونەوە دەربڕین و بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە جارێکیتر ئەو گوناهە دووبارە نەکاتەوەو هەرگیز نەگەڕێتەوە سەری.

خوای گەورە مرۆڤی بەدیهێناوە بۆ تاقیکردنەوە لەبەرئەوە توانـای چاکـەکاریو خراپـەکاری پـێ بەخشـیوەو کـردن و نـەکردنی هـەرکام لەوانەیشـی داوەتـە دەسـت مرۆڤەکـە خـۆی. وەک دەفەرمویت: ( ونفس وما سواها فألهمها فجورها وتقواها) لەهەمان کاتیشـدا فـەرمانمان پێدەکـات بەوەی کە دەروونمان پـاک بکەینـەوەو چاکـەکاری تێـدا گەشـەبکەین و ناکـامی هەردووکیشـیان دیاریکراوە (قد أفلح من زكاها وقد خاب من دساها) . تاوانکردن شتێکی سروشتییە، هەروەک چۆن پێغەبەری خۆشەویسـتمان دەفـەرمویت: (هـەموو مرۆڤـەکان هەڵـەو تـاوان دەکـەن، چاکـترینی ئەوانەش ئەوانەیانە کە تەوبە دەکەن). ترمذی گێڕاویەتیەوە .

تەوبەکردن یان لەبێ بڕواییە وەیان لە گوناهو تاوانە .

یەکەمیان وەرگیراوە، بەڵام دووەمیان پێویستە کە پەیمانی ڕاسـت بـدات تـاکو نەگەڕێـەوە سەریو ئەو گوناهانە دووبارە نەکاتەوە .

مەبەستیش لە (وەرگیراو) واتـە: ڕزگـاربوون لـە سـزای ئـەو گونـاهو تاوانانـەی کـە پێشـتر کردوویەتی، وەک ئەوەی کە هیچ تاوانێکی نەکردبێت .

تەوبەش پەشیمان بوونەوەیە لە پێشێل کردنی مافێک لـە مافـەکانی پـەروەردگار (حق الله) یان مافێک لە مافەکانی مرۆڤ (حق الناس)، یەکەمیان بەوە وەردەگرێت کە ئەو مرۆڤە پەشـیمان بوونەوەی تەواوو بڕیاردانی یەکجارەکی دەرببڕێـت، بەڵام دەبێـت ئـەوەشمان لـە یـاد نـەچێت کـە هەندێک تاوان هەیە کە بەوازهێنانی تەنها لـە کۆڵمـان نابێتـەوە، بـەڵکو دەبێـت ئـەو ئەرکـەی سەرشانی بە (قضاء) بەجێ بهێنێـت و پاشـان (کـەفارەت)ی بـدات، وەک دواخسـتن و نـەکردنی نوێژو ڕۆژوو بەبێ بیانووی شەرعی، دووەمیشیان کە پێشێل کردنی مافی مرۆڤە، دەبێت مافەکـە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی و گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات .

## چۆن تەوبە بکەین و مەرجەکانی چین ؟

پێویستە هەموو موسڵمانێک پەشیمان ببێتەوە لەو کەمتەرخەمیو یاسا شکاندنانەی کردوویەتی، که لەبنەڕەتدا دەبوایە سوپاسی پەروەردگاری بکردایەو بەتاوان و گوناهکردن هەڵنەستایەو سەرپێچی خوای گەورەی نەکردایە.

(عەبدوڵلای کوڕی موبارەک) هەندێک مەرج بۆ تەوبەکردن باس دەکات کە ئەمانەن :

١- پەشیمانی دەربڕین .
٢- بڕیار بدەین کە جارێکیتر نەک هەر ئەو کارە نەکەین بەڵکو توخنیشی نەکەوینەوە.
٣- گەڕانەوەی مافی خەڵکی کە پێشتر پێشێلمان کردبوون.
٤- گەڕانەوەی (قضاء) فەرزە لەکیس چووەکان .
٥- بەردەوام خەم و پەژارەی ئەوەمان هەبێت بۆ ئەو کاتانەی لە تاوانکردندا بەسەرمان بردووە.
٦- هەوڵ بدەین تامی راستەقینەی خواپەرستی بچێژین .
٧- دوورکەوتنەوە لەو جێگەو شوێنانەی کە تاوانیان تێدا ئەنجام دەدرێن .
٨- دەبێت زوو تەوبە بکەین و دوایئەخەین، چونکە نازانین کەی دەمرین.

## خوای گەورە تەوبەکردنی بەندەی خۆی پێخۆشە :

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت: ( خوای گەورە زۆر دڵ خۆشتر دەبێت بە تەوبەی بەندەیەکی خۆی لەکەسێک کە لەپڕ وڵاخەکەی بەتفاقەکەیەوە لە بیابانێکدا ون دەکات. زۆر بەدوایدا دەگەڕێت تا شەکەت و ماندوو دەبێت، لە برساناو لەتینواندا بێهۆش خەو دەیباتەوە، کاتێک بەئاگادێتەوە دەبینێت وڵاخەکەی بەبارەوە لەپشت سەریەوە وەستاوە، ئەو کەسە لەخۆشیاندا دەست بەرزدەکاتەوە بەرەو بارەگای پەروەردگارو لەعەزرەتا لێی تێک دەچێت و دەڵێت: خوایەگیان! تۆ بەندەی منیت و من خوای تۆم !! -مسلم- گێڕاویەتیەوە .

دەرگای ئاسمانەکان هەمیشە لەسەرپشتە بۆ تەوبەکاران وەک پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت: ( خوای گەورە دەستی میهرەبانی خۆی بەشەودا درێژ دەکات تاکو گوناهبارانی رۆژ تەوبە بکەن و پەشیمان ببنەوە، هەروەها دەستی میهرەبانی خۆی بەرۆژدا درێژ دەکات تاکو تاوانبارو گوناهکارانی شەو تەوبە بکەن و پەشیمان ببنەوە، ئەمەش بەردەوامە هەتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵدێت ) . موسلیم گێڕاویەتیەوە.

هەروەها لەفەرمایشتێکدا دەفەرموێت: ( خوایگەورە لە (حدیثی قدسی)دا دەفەرموێت: (من لە چاک گومانی بەندەی خۆمدام، لای ئەوم لەهەر شوێنێک بێت و یادم بکات، هەرکەسێک یەک بست لێم نزیک ببێتەوە ئەوا من یەک باڵ لێی نزیک دەبمەوە، وە ئەوەی باڵێک لێم نزیک بێتەوە، من چوار باڵ لێی نزیک دەبمەوە، ئەگەر بەپیادە بەرەورووم بێت من بەڕاکردن بەرەو ئەو دێم ) ! .. بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە .

بێگومان ئەم خۆشیەی پەروەردگار لەبەرانبەری بەندەکانی میهرەبانیو بەزەییە بۆ بەندەکان، چونکە خوایگەورە هیچ پێویستییەکی بەوان نییە لەبەرئەوە پێویستە مرۆڤ رێزی ئەو میهرەبانییە بگرێت و تەوبەو پەشیمانی لە گوناهو تاوانەکان دەرببڕێت و بێهیوا نەبێت لە لێبوردەیی و بەزەیی خوای گەورە، با لەوەو پێش سەرپێچی و تاوانی زۆریشی ئەنجام دابێت ،

چونکە پەروەردگار ڕوو بەو کەسانەی کە لە ئەنجامی گوناهکردنەوە نائومێدیی ڕووی تێکـردوون بە وشەی (عباد)و لە ڕێگەی پێغەمبەرەکەیەوە گفتوگۆیان لەگەڵ دەکات و، پێیان دەفەرموێت :
﴿قل یا عبادي الذین أسرفوا علی أنفسهم لا تقنطوا من رحمة الله إن الله یغفر الذنوب جمیعا إنه هو الغفور الرحیم﴾ الزمر/٥٣..
پیاوێک هاتە خزمەت (ابراهیمی کوڕی ادهم) و وتی: دەروونم پاڵم پێوەدەنێت تـاوان بکـەم ، چی بکەم بۆ ئەوەی ڕزگارم بێت؟ فەرمووی: کاتێک ویستت تاوان بکەیت لە ڕزق و ڕۆزی خوای گەورە مەخۆ، لەسەر زەوی ئەو مەخەوە، لەبەرچاوی ئەو تاوان مەکە !
کابرا وتی: چۆن دەتوانم شتی وا بکەم ؟! لـەکاتێکدا هـەرچی دەیخـۆم هـی خوایـەو هـەموو جیهانیش موڵکی ئەوەو لەهەر شوێنێکیش بم خوای گەورە چاوی لێمەو ئاگادارە؟!
ابراهیم وتی: ئایا شەرم ناتگرێـت کە لـە ڕۆزی خوای‌گـەورە دەخۆیـت و لەسـەر زەوی ئـەودا دەخەویت و بەبەرچاوی ئەویشەوە تاوان و گوناه دەکەیت ؟!
ئیتر پیاوەکە هۆش خۆی هاتەوەو پەشیمان بویەوە !
## بەچی تاوان گەورەتر دەبێت ؟!
مرۆڤ لە بنەڕەتدا سروشتێکی پاک و بێگەردی هەیەو دوورە لە گوناهو تاوانەوە، لەبەرئـەوە هەموو مرۆڤێکی بەویژدان و هەست پاک گوناهو تاوانی پێ ناخۆشەو ئەگەر جاروبارێک تـاوانیش بکات هەر زوو پەشیمان دەبێـەوەو هەست بە ئازاری دەروونی دەکات .
پێویسـتە مـرۆڤ زۆر شـەرم بیگرێـت و هـەرگیز تـاوان و گوناهـەکانی ئاشــکرا نـەکات و بیانشارێـەوە، پێغەمبەری ئازیزمان دەفەرموێت: ( خوای گەورە لەهەموو ئوممـەتی مـن خـۆش دەبێـت تەنها ئەوانە نەبێـت کە بەئاشکرا گوناهو تاوان دەکەن بەڕاستی ئەوئاشکراکردنە کـارێکی خراپە چونکە کاتێک مرۆڤێک بەشەو کارێک بکات و خوای‌گەورە دایپۆشێت، بەڵام خۆی جاڕی بۆ بدات و بڵێت: دوێنێ شەو ئەو کارەم کرد!) موسلیم گێڕاویەتیەوە.
بێگومان ئەو تەوبەو لێخۆشبوونە ئەوانە ناگرێـتەوە کە کۆدەبنەوەو بەشانازیەوە باسـی ئـەو تاوان و گوناهانە دەگێڕنەوە لەکاتێکدا کەکەس نەیزانیوەو بەنهێنی کردوویانە، بـەوەش تاوانەکـە لای خوای گەورە دووبارە گەورەتر دەبێـت .
## تەوبەی بۆنەکان :
یەکێک لەو شتە سـەیرو سەمەرانەی هاتووەتـە نـاو پـەیام و بەرنامـەی ئیسـلامەوە تەوبـەی بۆنەکانـە، کەبەڕاسـتی ئـەمجۆرە تەوبەکردنـە هـەرگیز لـە ئـاییندا نیـیـە، بـەڵکو زیـاتر لـە گاڵتەپێکردنـەوە نزیکـە، چونکـە پـەیوەندی نێـوان مـرۆڤ و پەروەردگارەکـەی پەیوەندییـەکی هەمیشەییو بەردەوامە نەک شتێکی کورت و کەم و کاتیی، یان هەندێک کەس هەیـە تـەنها لـە بۆنەو جەژنەکاندا تەوبەدەکەن یان لە مانگی ڕەمەزان و ڕۆژانی هەینیدا یان .. هتد.
خوای گەورە دەفەرموێت: ( باوەڕداران ..! بگەڕێنەوە بۆ لای خوای‌گەورەو تەوبە بکـەن ..!) ئیتر نایبەستێـەوە بە کات و شوێنەوە بەڵکو دەرگای لێبوردنی خوایی هەمیشە والایـە لەهـەموو کات و شوێنێکدا..

تەوبەیەک وەردەگیرێت کە هەمیشەییو بەردەوام بێت وە نابێت هەرگیز لە نیازو مەبەستی دڵماندا ئەندیشەی وا هەبێت کە گوایە جارێکیتر بگەڕێینەوە بۆ تاوان کردن، نەبادا ئێمەش وەک هەندێک لەو کەسانەبین کە لەمانگی رەمەزاندا تەوبەدەکەن و بەرۆژوو دەبن، بەلام هەر لەبنەڕەتدا نیازیان وایە کەتەنها لەرەمەزاندا تەوبەکار بن، لەبەرئەوە هەر لەیەکەم رۆژی جەژنەوە دەچنەوە سەر باری پێش رەمەزانیان، خوای گەورە پەنامان بدات لەم جۆرە تەوبانەو لەهەموو تەوبەیەکی بۆنەو موناسەبات !

## ئەو شتانەی هانی مرۆڤ دەدەن لەسەر بەردەوامی تەوبە :

گرنگترین هۆکار کە هانی مرۆڤ دەدات بۆ تاوان و سەرپێچی ئەو ناوەندە کۆمەلایەتییە کە تیایدا دەژی، هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویستمان چیرۆکی پیاوێکی جولەکەمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێت:

(ئەم پیاوە ٩٩ کەسی کوشتبوو، کاتێک ویستی تەوبە بکات پیاوچاکێک ئامۆژگاریو رێنمونیی کرد بەوەی کە پێویستە ئەو شوێنە بەجێبهێڵێت کە تیایدا نیشتەجێیەو رووبکاتە گوندێکیتر کە زۆربەیان پیاوچاک و رەوشت بەرزن تاکو لەوانەوە خووی باش و پەسەند وەربگرێت، ئەوەبوو پیاوەکە رۆیشت و لەرێگا مەرگ یەخەی پێگرت، فریشتەی بەزەییو سزا هاتنەسەری هەریەکەیان دەیویست بەرەو جێگای خۆی بیبات لە ئاکام دا لەلایەن خوای گەورەوە فەرمان هات و کێشەکەی بۆ چارەسەرکردن، وە لەبەرئەوەی کابرا زیاتر بەوشێنی چاکەخوازەکەوە نزیک بوو، خوایگەورە بڕیاری لێخۆشبوونی دا) . بوخاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە.

کەواتە جۆرو شێوازی پەروەردەو ناوەندی خێزانیو کۆمەڵ و کۆمەڵگە دەورێکی گرنگیان هەیە لە گۆڕانکاری مرۆڤ دا. یەکێک لەو هۆکارە سەرەکییانە کە خوایگەورە زۆر گەل و نەتەوەی لەناوبردووە بەپاک و پیسیەوە قین و خەشمی لێگرتووە ئەوەیە کە مرۆڤە چاکەکان هەڵنەساون بەئەرکی خۆیان لە گۆڕانی کۆمەڵداو بە دوورەپەرێزی ژیاون.

## لە کۆتاییدا دەڵێین :

ئەمەن بریتییە لەچەند کاتێک کە رۆیشت ناگەڕێتەوە، بۆیە پێویستە هەر لەئێستاوە کاتەکانمان بەفرسەت بزانین و لە تاوان و سەرپێچی کردنمان پەشیمان ببینەوە، هەتا خوایگەورە دەرگای سۆزو میهرەبانی خۆیمان لەسەر والابکات لە پەروەردگار دەپاڕێینەوە کە لێمان خۆش ببێت و سەرفرازیی هەردوو دنیامان بکات.

# له خۆپرسینەوە

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ( یا أیها الذین آمنوا اتقوا الله ولتنظر نفس ماقدمت لغد واتقوا الله إن الله خبیر بما تعملون) الحشر/١٨.

واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە پارێزکاری (سنوورەکانی) خودا بکەن و با هەریەکێکتان سەیربکات چی بۆ سبەینێی پێش خستووە، پارێزگاری (سنوورەکانی) خودا بکەن ، بێگومان خودا ئاگادارە بەو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن.

بۆ ئەوەی یەکێک بگاتە پلەی پارێزکاری (التقوی) پێویستە زوو زوو بەخۆیدا بچێتەوەو لەخۆی بپرسێتەوە، سەرژمێری کردەوەکانی ڕۆژانەی بکات و هەڵوێستەی لە ئاستیاندا هەبێت، تا لێیانەوە خۆی بناسێت، هەر بۆیە خودای گەورەش جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە خەڵکی لەخۆیان بپرسنەوەو بەخۆیاندا بچنەوە پێش ئەوەی لە قیامەتدا خوای گەورە لێیان بپرسێتەوە، چونکە لەو ڕۆژەدا هیچ ون نابێت و هەموو نهێنیو وردەکارییەکان ئاشکرا دەبن، کەواتە دەبێت:

لەخۆپرسینەوە چی بێت ؟

بۆچی کەسێک لەخۆی بپرسێتەوە ؟

لە چیدا لەخۆی بپرسێتەوە ؟

**یەکەم :** لەخۆپرسینەوە : ئەوەیە کە کەسێک بەکردارو گوفتارو باروودۆخی ڕۆژانەی یا مانگانەی یا ساڵانەی یا هەموو تەمەنی خۆیدا بچێتەوەو چاویان پێدا بخشێنێتەوە، ئەگەر کردارێکی چاکی بینی ئەوە سوپاسی خودا بکات لەسەری، خۆ ئەگەر خراپەیەکیشی بینی ئەوا پەشیمان ببێتەوە لێیو، تەوبە بکات.

پاش تەوبەکردن پێویستە مرۆڤ ئەچێتەوە بەلای ئەو کردارە خراپانەداو وازیان لێبهێنێت: (ولم یصروا علی مافعلوا وهم یعلمون) آل عمران/١٣٥ .

ئەو کەسەی تەوبە لە تاوانێک دەکات و بەردەوامیش دەبێت لەسەری وەک ئەوە وایە گاڵتە بە پەروەردگاری خۆی بکات .

جا موسڵمانی ژیرو وریا ئەوەیە کە هەمیشە خۆی سەرزەنشت بکات و لەخۆی بپرسێتەوەو کار بۆ پاش مردنی بکات، ئەو کەسەش کە دەستەوسانە هیچی لەدەست نایەت و ملکەچی ئارەزووەکانی خۆیەتیو هەر لەسەر خۆزگەو ئاوات دەژی..) .

**دووەم :** مرۆڤ حاڵەتی لاوازو بێئاگایی بەسەردا دێت و لەو کاتانەدا دەکەوێتە هەڵەو تاوانەوە، بۆیە تەوبەکردن پێویستە (کل بنی آدم خطاء وخیر الخطائین التوابون) رواه الترمذي .

هەموو مرۆڤێک تاوان و هەڵە دەکات، بەڵام باشترینیان ئەوانەن تەوبە دەکەن.

**سێیەم :** خوای گەورە تەوبەی بەندەکانی خۆی لا خۆشەو هەرگیز دەست نائێت بەڕوویانەوە، بەخشندەو لێخۆشبوو میهرەبان تەوبەکاران بێئومێد ناکات، وەک ئەم فەرموودەیە ڕوونی دەکاتەوە: ( إن الله یبسط یده باللیل لیتوب مسيء النهار ویبسط یده بالنهار لیتوب مسيء اللیل حتی تطلع الشمس من مغربها) - موسلیم گێڕاویەتیەوە-

خوای گەورە بەشەو دەرگای لێخۆشبوون بۆ عەبدەکانی والاّدەکات تا لە تاوانبارانی شەو خۆش ببێت، هەروەها بە ڕۆژ والاّی دەکات تا لە تاوانبارانی شەو خۆ ببێت، ئەمەش بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت.

## بۆچی کەسێک لە خۆی بپرسێتەوە ؟

١- تا لێپرسینەوەی قیامەتی ئاسان بێت :

شێخ حسنی بصری -خوا لێی رازی بێت- دەفەرموێت: (موسڵمانی خاوەن باوەڕ زاڵە بەسەر خۆیداو لێی دەپرسێتەوە، لێپرسینەوەی قیامەت لەسەر ئەو کەسانە ئاسان دەبێت کە لەدنیادا لەخۆیان دەپرسنەوە، لەسەر ئەو کەسانەش توندو گران دەبێت کە لەخۆیان ناپرسنەوەو کارەکەیان بەلاوە بێ‌نرخە). پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: هەرکەسێک لە قیامەتدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێت سزا دەدرێت، جارێک عائشە وتی: ئەی ئەوە نی‌یە خوا دەفەرموێت: ( فأما من أوتي كتابه بيمينه فسوف يحاسب حسابا يسيرا) پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (ئەوە لێپرسینەوە نی‌یە بەڵکو تەنها پیشاندانە، ئەوەی لێی بپرسرێتەوە سزا دەدرێت) (متفق عليه) لەمەوە دەردەکەوێت کە ئەمجۆرە وردەکاری تێدا ناکرێت بەمیهرەبانیو بەخشندەیی خوای گەورە کردەوە بچوکەکان باسیان لێ‌ناکرێت، لەفەرموودەیەکدا هاتووە دەڵێت: (يدني ا لله تعالى المؤمن في يوم القيامة فيضع عليه كنفه فيقرره بذنوبه: أتعرف ذنب كذا في يوم كذا فيقول: أعرف، فيقول ا لله عزوجل أنا سترتها عليك في الدينا وأنا أغفرها لك فيعطي صحيفة حسناته وأما الكافر والمنافق فينادى عليه رؤوس الخلائق هؤلاء الذين كذبوا على ربهم ألا لعنة ا لله على الظالمين) متفق عليه .

خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا لە خاوەن باوەڕێک نزیک دەبێتەوەو ناهێڵێت خەڵک ببینن و لە گوناهو تاوانەکانی دەپرسێتەوەو ئەویش دانی پێدا دەنێت: ئایا دەزانیت لە فلانەڕۆژدا فلانە تاوانت ئەنجام دا، ئەویش دەڵێت: بەڵێ، وایە - خوایگەورە دەفەرموێت: ئەوە لە دنیادا بۆم پۆشیویت و لێرەش لێت خۆش دەبم، ئەوجا کارنامەیەکی دەدرێتە دەست، بەلاّم بێ‌باوەڕو دووڕووەکان بەبەرچاوی هەموو خەڵکی‌یەوە بانگ دەکرێن،: ئەمانە بوون لەگەڵ خودای خۆیاندا درۆیان کردووە، نەفرەتی خودا لە ستەمکاران ) .

٢- باوەڕداری بەئاگا زۆر لە خۆی دەپرسێتەوەو سەرزەنشتی خۆی دەکات، چونکە شایەتەکانی قیامەت زۆرن و ناتوانرێت بەهەڵەدا ببرێن و سەریان لێ تێک بدرێت، بەرتیل و ناسیاوی‌و بیرچوونەوە رونادات، گەورەترین شایەتیش خودای گەورە خۆیەتی چونکە فەرموویەتی: ( ما يكون من نجوى ثلاثة إلا هو رابعهم ولا خمسة إلا هو سادسهم) پاشان پێغەمبەرانن ، ئەوجا فریشتەکان (إذ يتلقى المتلقيان عن اليمين وعن الشمال قعيد، مايلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد) دوای ئەوان ئەندامەکانی لەش دەبنە شایەت ( اليوم نختم على أفواههم وتكلمنا أيديهم وتشهد أرجلهم بما كانوايكسبون)، لەو ڕۆژەدا پێستی مرۆڤیش دێتە گۆو شایەتی خۆی دەدات ( وقالوا لجلودهم لم شهدتم علينا قالوا أنطقنا ا لله الذي أنطق كل شيء)، سەرەڕای هەموو ئەمانە زەوی شایەتی کردەوەو کارەکانە (يومئذ تحدث أخبارها) بەپێغەمبەریان ﷺ وت: هەواڵی زەوی چی‌یە، ئەویش فەرمووی: شایەتی دەدات بەسەر خەڵک و گەلانەوە کە چی‌یان لەسەرئەنجام داوە، دەڵێت: فلانە ڕۆژ و کات فلانە کارت کرد.. ) .

٣- دەروون و نارەزووەکانی مرۆڤ ئەگەر سنووریان بۆ دانەنرێت و کۆنترۆڵ نەکرێن هەڵەو تاوانی گەورە بەرپادەکەن و مافی خەڵکانی تر دەفەوتێنن، بۆیە لێپرسینەوەو پێداچوونەوەی بەردەوام پێویستە لەسەریان، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت: ( إن النفس لأمارة بالسوء) یوسف/٥٣.. هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (بەهەشت بەناخۆشی دەورەدراوەو دۆزەخیش بەنارەزووەکان) صحیحی ئەلبانی ژمارەی فەرمووده (٣١٤٧) .

جا ئەگەر نارەزووەکان بەریان بۆ شل بکرێت و مرۆڤ ملکەچیان ببێت و بەدەم هەموو داواکاریەکانیانەوە بچێت، ئەوا دوور نییە بەرەو دۆزەخی بەرن و ڕێگەی بەهەشتی لێ تێک بدەن، لەبەر ئەم سیفەتەی. کەواتە نەفس و دەروون پێویستی بە لێپرسینەوەی بەردەوام و خۆگرتنەوەو ڕاهێنان و سەرزەنشت و ناسینی تەواو هەیە.

مرۆڤ ئەگەر لەحاڵەتی لاوازیی لەیادچووندا تووشی تاوانێک بوو، دەتوانێت لەبەرامبەریدا بەپەرستشی زیاتر وەکو بەرۆژووبوون یان بەبەخشینی شتێک پاش تەوبەکردنی تەواو قەرەبووی ئەو تاوانەی بکاتەوە، هەندێک لە پیاوچاکان ئەگەر خەریک بوایە تووشی تاوانێک ببن، پەنجەیان لە ئاگرێک نزیک دەخستەوەو بەخۆیان دەوت: ئەگەر بەرگەی ئاگری دنیا ناگریت، ئەی بۆ ئاگری دۆزەخ چی دەڵێیت؟ بەم جۆرە مرۆڤ دەتوانێت ئارەزووی هەڵچووی خۆی بۆ تاوانکردن دامرکێنێتەوەو خۆیشی بپارێزێت .

## مرۆڤ لە چیدا لە خۆی بپرسێتەوە ؟

١) **لە کاتدا** : خوای گەورە ئەوەندە کاتی مرۆڤی بەلاوە گرنگە گەیاندویەتیە ڕێژەی سوێند پێخواردن (والعصر إن الإنسان لفي خسر ) کات گرنگە چونکە کردارو مامەڵەی ڕۆژانەی مرۆڤی تێدا ڕوودەدات .

(فضیل کوڕی عیاض) لە مانای وتەیەکدا دەفەرموێت: (ئەی ئەوەی ئادەم، ژیانی تۆ ژمارەیەکە لە ڕۆژ، هەر ڕۆژێک بەشتێک لە تۆ کەم دەبێتەوە).. (توبەی کوڕی صامت) لە تەمەنی شەست ساڵیدا جارێک دانیشت لە خۆی بپرسێتەوە، کە ڕۆژەکانی تەمەنی خۆی لێک دایەوە بینی بیست و یەک هەزارو پێنج سەد ڕۆژ بوو، دەستی کرد بە گریان و وتی: باشە ئەگەر هەر ڕۆژەی تەنیا یەک گوناهم کردبێت، چۆن ڕووم بێت بە کارنامەیەکەوە لەبەردەم خوای گەورەدا ڕاوەستم کە بیست و یەک هەزارو پێنج سەد گوناهی تێدابێت، ئەوەندەی وتەوە تا لەهۆش خۆی چوو، کە هۆشی هاتەوە وتی: هاوار بۆ تۆ خوایە، ئەی ئەگەر ڕۆژی دوان یان سیان یان دە گوناه بن من چی بکەم..؟) .

٢) **لە سەروەت و سامانی دنیا** :

**لە چۆنیەتیی پەیداکردن و خەرج کردنیدا:**

پێکەوەنان و دەستکەوتنی پارەو سامانی دنیا یەکێکە لە حەزەکانی مرۆڤ و زۆرجار بەهۆیەوە تاوان و مەترسی ڕوو دەکاتە کۆمەڵگە، بۆ یە لێپرسینەوە لە چۆنیەتی دەست کەوتن و چۆنیەتی خەرج کردنیدا پێویستە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( من لم يبال من أين يكتسب ماله لا يبال الله من أي باب يدخله النار) ئەوەی بەلایەوە گرنگ نەبێت چۆن پارەو سەروەت و سامانی چنگ دەکەوێت، خوای گەورەیش بەلایەوە گرنگ نییە لەهەر دەرگایەکەوە بۆ دۆزەخی بنێرێت.

باوەڕداری راستەقینە سەرچاوەی دەوڵەمەندبوون و پارە دەستکەوتنی خۆی زۆر لا گرنگە چونکە هۆکاری هەموو تاوان و بەتاڵ کردنەوەی هەموو کردارێکی چاکەیە.

لەمەڕێکی ترەوە لێپرسینەوە لەوەدا پێویستە کە ئەو پارەو سامانە لە چیدا خەرج دەکرێت و چۆن بلاودەبێتەوە، چونکە مرۆڤ جێگەدارە تیایداو خاوەن ماڵی راستەقینە هەر خودایە (وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ) الحديد/٧ . داخستنی دەرگاکانی خێرو چاکەخوازیو خەرج نەکردنی پارەو ماڵ تیایدا تاوانە .

٣) **گەردن ئازادبوون لە مافی خەڵک** :

مافی خەڵک بەلای خودای گەورەوە زۆر گرنگە، ئەگەر لە مافی خۆی ببورێت لە قیامەتداو لێخۆش ببێت، ئەوا لەمافی خەڵک خۆش نابێت و بە وردی دەربارەی دەکۆڵێتەوە، تەنانەت شەهیدی رێگەی خودا هەموو گوناهو تاوانەکانی هەڵدەوەرن و هیچی پێوە نامێنێت تەنها قەرزەکانی نەبن، زۆرجار کە لاشەی پیاوێکیان بهێنایە بۆ مزگەوت تا نوێژی لەسەر بکەن، پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: قەرزی لەسەرە؟ ئەگەر بیان وتایە بەڵێ، دەیفەرموو: نوێژ لەسەر براکەتان بکەن). واتە ئەو نوێژی لەسەر نەدەکرد، بۆیە پێویستە مرۆڤی خاوەن باوەڕ ئەم باسەی لا گرنگ بێت و گەردنی خۆی بەخەڵک ئازادبکات و مافی خەڵکی بگێڕێتەوە بۆیان، ئەوە پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنی پیرۆزیدا دەچێتە سەر دوانگەو دەفەرموێت: ئەوە پشتم، کێ قامچیەکم لێداوە با لێم داتەوە، مەشڵێن تاوانەکانی خۆی ئاشکرا دەکات، ئەوەی لە دنیادا ئاشکرابێت باشترە لەوەی خودا لە قیامەتدا ئاشکرای بکات) هەروەها دەفەرموێت: (من كانت عند أخيه مظلمة فليتحلله منها اليوم قبل أن يأتي يوم لا ينفع فيه درهم ولا دينار).

٤) **گوفتار** :

موسڵمان پێویستە لەو وتارو قسەکردندا ئاگای لەخۆی بێت و زوو زوو بەخۆیدا بچێتەوە، چونکە قسە زۆر کاریگەرەو هەست بریندار دەکات و دوورنییە دۆستێکی دەیەها ساڵە بە قسەیەک بڕەنجێنێت، جارێک -معاذی کوڕی جەبەل- وتی: ئایا ئێمە لەسەر قسەکانمان هیچمان لێدەگیرێت، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: يامعاذ ثكلتك أمك وهل يكب الناس على مناخرهم في جهنم إلا ما نطقت به ألسنتهم) اخرجه الحاكم وقال صحيح على شرط الشيخين وصححه الالباني رقم الحديث ٤١٢.

واتە: معاذ ئەی لەباردایکت چیت.! باشە هەر سەرەنجامی دەم و قسە نییە خەڵکی بەرەو دۆزەخ دەبات.

غەیبەت کردن و دۆزینەوەو گەڕان بەشوێن کەموکوڕیو تاوانی خەڵکدا لەوجۆرەیە کە خوا پێی رازی نییە. چونکە هەر کەسێک بەشوێن عەیبی خەڵکیدا بگەڕێت و بیەوێت ئاشکرای بکات و بیەوێ ئەو کەسەی پێ سووک بکات، ئەوە خوای گەورە عەیبی ئەو کەسە ئاشکرا دەکات و لەناو خەڵکیدا سووک دەبێت .

# پارێزکاری (التقوی)

**پێناسەی تەقوا:**

پارێزکاری یان (تەقوا): بریتییە لە خۆ پاراستن لە تووڕە بوونی خواو سزای سەختی قیامەت، ئەمەش بە ئەنجامدانی هەموو کردەوە چاکەکان و خۆ پاراستن لە هەموو قەدەغە کراوەکان دێتە دی.

لە قورئاندا لە هەردوو حاڵەتەکەدا خوای گەورە موسڵمانان بیر دەخاتەوەو داوای تەقواو پارێزکارییان لێ دەکات، بۆ نموونە: ﴿وما آتاكم الرسول فخذوه وما نهاكم عنه فانتهوا واتقوا الله إنّ الله شديد العقاب﴾ الحشر/٧. ﴿أحلّ لكم ليلة الصيام الرفث إلى نسائكم... ولا تباشروهنّ وأنتم عاكفون في المساجد، تلك حدود الله فلا تقربوها كذلك يبيّن الله آياته للناس لعلهم يتقون﴾ البقرة/١٨٧. ﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وذروا ما بقي من الرّبا..﴾ البقرة/٢٧٨. ﴿يا أيها الذين آمنوا لا تتخذوا الذين اتخذوا دينكم هزواً ولعباً... واتقوا الله إن كنتم مؤمنين﴾ المائدة/٥٧. ﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وكونوا مع الصادقين﴾ التوبة/١١٩. ﴿واتقوا يوماً ترجعون فيه إلى الله...﴾. ﴿فاتقوا الله ما استطعتم.﴾ التغابن/١٦.

**پلە و پایەو گرنگیی تەقوا :**

أ - خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ولقد وصينا الذين أُتوا الكتاب من قبلكم وإيّاكم أن اتقوا الله﴾النساء/١٣١. واتە: ئێمە ئامۆژگاری ئەوانەمان کردووەکە پەیامیان بۆ هاتبوو لە پێش ئێوەدا، وە ئامۆژگاری ئێوەشمان کردووە کە لەخوا بترسن و خۆتان لە نافەرمانی بپارێزن. کەواتە ئەوە ئامۆژگاری خوایە بۆ هەموو ئەو گەلانەی کە پێغەمبەرانیان بۆ نێرراوە: ﴿وإذ نادى ربّك موسى أن ائتِ القوم الظالمين، قوم فرعون ألا يتّقون﴾الشعراء/١٠. ﴿إذ قال لهم أخوهم نوح ألا تتقون﴾الشعراء/١٠٥. ﴿إذ قال لهم أخوهم هود ألا تتقون﴾الشعراء/١٢٣.. ﴿إذ قال لهم أخوهم لوط ألا تتقون﴾الشعراء/١٦٠. ﴿إذ قال لهم أخوهم شعيب ألا تتقون﴾الشعراء/١٧٦. ﴿وإنّ إلياس لمن المرسلين، إذ قال لقومه ألا تتقون﴾الصافات/١٢٣. ﴿كذبت ثمود المرسلين إذ قال لهم أخوهم صالح ألا تتقون﴾الشعراء/١٤٢.. حەزرەتی عیسا (عليه السلام) فەرموویەتی: ﴿وجئتكم بآية من ربّكم فاتقوا الله وأطيعون﴾آل عمران/٥٠. قورئانیش لەسەر زمانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ﴿يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حقّ تقاته ولا تموتنّ إلاّ وأنتم مسلمون﴾آل عمران/١٠٢.. هەر بۆیە خوای گەورە بە پێغەمبەری خۆشەویستی فەرموو: ﴿يا أيها النبيّ اتق الله..﴾الأحزاب/١.

ب - خوای پەروەردگار تەقوای کردۆتە پێوەری دوور و نزیکی بەندەکانی لە خۆیەوە ﴿إنّ أكرمكم عند الله أتقاكم﴾الحجرات/١٣، واتە: چاکترینتان لای خوا بە تەقواترینتانە.

- باشترین توێشوو لە دنیادا کە هەوڵی بۆ بدرێت و بەدەست بهێنرێت بۆ قیامەت تەقوایە ﴿وتزوّدوا فإنّ خير الزاد التقوى﴾البقرة/١٩٧، توێشوو بخەن، چاکترین توێشوو تەقوایە.
- چاکترین بەرگ بەرگی تەقوایە کە مرۆڤ بەرز ڕادەگرێ و عەیبەکانی دادەپۆشێ ﴿يا بني آدم قد أنزلنا إليكم لباساً يواري سوآتكم وريشا ولباس التقوى ذلك خير﴾الأعراف/٢٦، واتە: ئەی

ئەوەی ئادەم لە ئاسمانــەوە بـەرگێکمان بـۆ نـاردوون کـە بیکەنـە بـەرتان و عـەورەتتانی پـێ داپۆشن و جوانتان بکات، وە بەرگی تەقوا چاکترە.

- تەقوا هەستی بەرپرسیاری و لەخۆ پرسینەوە لە دڵ و دەروونـدا زیـاد دەکـات: ﴿یا أیها الذین آمنوا اتقوا الله ولتنظر نفس ما قدمت لغدٍ واتقوا الله...﴾الحشر/١٨.
- خوای گەورە تەنها کردەوەی ئەو کەسانە وەردەگرێت کە لەخواترس و پارێزکارن: ﴿إنّما یتقبّل الله من المتقین﴾المائدة/٢٧.
- خۆشەویست و دۆستانی خوا ئەوانەن کە پارێزکارن: ﴿إنّ الله یحبّ المتقین﴾التوبة/٧. ﴿ألا إنّ أولیاء الله لا خوف علیهم ولا هم یحزنون، الذین آمنوا وکانوا یتقون﴾الونس/٦٣، واتە: خۆشەویستان و دۆستانی خـوا ناترسـن و دڵتەنگ نـابن (لە دنیـاو ئاخیـرەتدا) ئـەو کەسـانەی کـە بـڕوادارو پارێزکارن.
- قورئان ڕێنمایی و یادخەرەوەیە بۆ پارێزکاران: ﴿و إنه لتذکرة للمتقین﴾الحاقة/٤٨. ﴿ذلك الكتاب لا ریب فیه هدی للمتقین﴾البقرة/٢.
- پارێزکاران لە هەموو کەس زیاتر هەست بە فێڵی شـەیتان دەکـەن و خۆیـان ڕزگـار دەکـەن لە هێرش و پـەلامارەکانی: ﴿إنّ الذین اتقوا إذا مسّهم طـائف مـن الشـیطان تذکّـروا فـإذا هـم مبصرون﴾الأعراف/٢٠١. بەڕاستی ئەوانەی کە لەخوا دەترسن هـەرکاتێك خـەیاڵێك لەلایـەنی شەیتانەوە لێیان بـدات و پاڵیـان پێـوە بنێـت بۆهـەوادانیان گـورج بـیری خـوای پـەروەردگار دەکەنەوەو پەنای بۆ دەبەن و خواش زوو حاڵیان دەگۆڕێت بۆ شادمانی بینینی ڕێگەی ڕاست.
- بنیات نـانی هـەر کـارێك بـەبێ تـەقوا بەرەنجامـەکـەی مایـەی پـوچ دەبـێ و خاوەنەکـەشـی دەخرێتە دۆزەخەوە: ﴿أفمن أسّس بنیانه علی تقوا من الله ورضوان خیر أم من أسس بنیانه علی شفا جُرفٍ هارٍ فانهار به في نار جهنّم؟ والله لایهـدي القـوم الظـالمین﴾التوبة/١٠٩، واتـە: ئایـا کەسـێك ئاییـنی خۆی دامـەزراندبێت لەسـەر تەقواو ترس لەخوا، وەکـو یـەکێك وایـە کـە بینـای خـۆی دانابێت لەسەر (قەراغی) کەنارێکی وا ئاوی لافاو دریبێتی و نزیك بێت لەوەوە ها ئێسـتا ئـا تاوێکی تر بڕوخێت و بەو کەسەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ؟!
- سەرکەوتن و یارمەتی خوا و پاشەڕۆژ بۆ پارێزکارانـە: ﴿واعلمـوا أن الله مـع المتقـین﴾التوبة/٣٦. ﴿والعاقبة للتقوی﴾طه/١٣٢. ﴿إنّ الله مع الذین اتقوا والذین هم محسنون﴾النحل/١٢٨.
- ڕۆزی چاك و دەرچوون لە هەموو تەنگ و چەڵەمەیەك بەستراوە بە تـەقواوە: ﴿ومن یتّقِ الله یجعَل له مخرجاً ویرزُقه من حیث لا یحتَسـب﴾الطلاق/٢. هـەر کەسـێك لەخـوا بترسـێت خـوا سەرفرازی دەکات و ڕۆزیی بۆ دەنێرێت لەلایەکەوە کە گومانی بۆی نەچێت.
- پارێزکاران خـوا هـەموو کارێکیـان بـۆ ئاسـان دەکـات: ﴿ومن یتق الله یجعـل لـه مـن أمـره یُسراً﴾الطلاق/٤.
- پارێزکاران هەق و ناهەق لەیەك جیادەکەنەوەو سەریان لێ ناشێوێت: ﴿یا أیها الذین آمنوا إن تتّقوا الله یجعَل لکم فرقاناً ویُکفّر عنکم سیّئاتکم ویغفِـر لکـم، والله ذو الفضـل العظیـم﴾الأنفال/٢٩، واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە ئەگەر خۆتان بپـارێزن لە گونـاه و لەخـوا بترسـن خـوا

ڕووناکیەکی وا دەخاتە دڵتانەوە کە هەق و ناهەق لەیەک جیا بکەنەوەو گوناهەکانتان دائەپۆشیت و نیتان خۆش دەبیت، وە خوا خاوەن فەزڵ و چاکەیەکی گەورەیە.

- خوای گەورە پارێزکاران موەفەق دەکا بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە: ﴿یا أیها الذین آمنوا اتقوا الله وقولوا قولاً سدیداً، یصلح لکم من أعمالکم ویغفر لکم ذنبکم، ومن یطع الله ورسوله فقد فاز فوزاً عظیماً﴾الأحزاب/٧١، واتە: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە لەخوا بترسن و قسەیەک بکەن کە ڕاست و تەواو بێت، خوا کردەوەکانتان بۆ باش دەکات و لە گوناهەکانتان خۆش دەبێت، کێ گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەکەی بێت سەرکەوتووە سەرکەوتنێکی گەورەو باش لە دنیاو قیامەتدا.

ج- لەڕۆژی قیامەتدا پارێزکاران پلەو پایەیەکی بەرزیان هەیە: ﴿إنّ المتّقین في جنّاتٍ وعیون، آخذین ما آتاهم ربُّهم إنهم کانوا قبل ذلك محسنین﴾الذاریات/١٦، واتە: پارێزکاران وان لە چەند بەهەشت و سەرچاوەیەکدا، ئەوەی پەروەردگاریان پێیی داون وەری دەگرن، چونکە بەڕاستی ئەوانە لە دنیادا چاکەکار بوون.. ﴿إنّ المتّقین في جنات ونَهَر في مقعد صدقٍ عند ملیك مقتدر﴾القمر/٥٥. ﴿وسیق الذین اتقوا ربهم إلی الجنّة زُمَراً﴾الزمر/٧٣.

د- هەندێک دەڵێن ئێمە پارێزکارە موسڵمانەکان دەبینین چەوساوەو زەلیلن، کەچی تاوانبارو شەڕخوازان دەبینین بەدەسەڵات و پێشکەوتوون، ئێمەش دەڵێین: ئەمڕۆ موسڵمانان وان لەژێر تاقیکردنەوەی خوایىدا: ﴿ولنبلونّکم حتی نعلم المجاهدین منکم والصابرین ونبلوَ أخبارکم﴾محمد/٣١. واتە: بەڕاستی تاقیتان دەکەمەوە تا بزانم کێتان جیهاد دەکات و ئارام دەگرێت و دەنگوباستان تاقی بکەینەوەو بزانین چۆن دەبن.. کاتێکیش حاڵی خراپکاران بەچاک دەبینین دەبێت بزانین کە خوا لغاوی بۆ شل کردوون و ئەوەش کەم خایەنەو سەرەنجام بەسزای سەختی خۆیان دەگەن: ﴿فلمّا نسوا ما ذکّروا به فتحنا علیهم أبواب کلّ شيء، حتی إذا فرحوا بما أوتوا أخذناهم بغتةً فإذا هم مبلسون، فقطع دابر القوم الذین ظلموا والحمد لله ربّ العالمین﴾الأنعام/٤٢، واتە: کاتێک ئامۆژگاری و پەنای ئێمەیان لەبیر کرد، دەرگای هەموو شتێکمان بۆ کردنەوە، هەتاکو دڵیان خۆش کرد بەو شتانەو لەخۆ بایی بوون، لەپڕ گرتمانن و کەوتنە داخ و حەسرەت و هەناسەی سارد هەڵکێشان، جا گەلی ستەمکاران دوابڕکرا، سوپاس و ستایشیش بۆ پەروەردگاری هەموو جیهانە.. لەم سەردەمەیشدا ڕەنگە موسڵمانان نرخی سەرکەوتنیان بەتەواوی نەدابێت و شەرتی تەقوایان نەهێنابێتە دی، بۆیە خوا هێشتا سەری نەخستوون، بەڵام دەبێ بزانین کە پاشەڕۆژ و ئەنجام هەر بۆ پارێزکارانە(والعاقبة للمتقین).

**خەسڵەت و ڕەوشتەکانی پارێزکاران:**

(١) ﴿ذلك الکتاب لا ریب فیه هدی للمتقین، الذین یؤمنون بالغیب ویقیمون الصلاة، ومما رزقناهم ینفقون، والذین یؤمنون بما أنزل إلیك وما أنزل من قبلك، وبالآخرة هم یوقنون، أولئك علی هدی من ربهم وأولئك هم المفلحون﴾البقرة/٢. واتە: ئەم قورئانە هیچ گومانێکی تیا نییە، ڕێ نیشاندەری پارێزکارانە، ئەوانەی:

أ - بڕوا دەهێنن بە شتی نادیار.

ب - نوێژ دەکەن.

ج - لەو ڕۆژەیەی پەیمان داون لێی دەبەخشن.
د - بڕوایان هەیە بەو بەرنامەیەی کە بۆ تۆ نێرراوەو بەو بەرنامانەی کە پێش تۆ نێرراوە.
هـ- بڕوایان هەیە بە ڕۆژی دوایی.
ئەوانە لەسەر ڕێی ڕاستن لەلایەن پەروەردگاریانەوە، وە هەر ئەوانن سەرفراز.

(٢) ﴿ليس البرّ أن تولّوا وجوهكم قبل المشرق والمغرب ولكنّ البرّ من آمن با لله واليوم الآخر والملائكة واالكتاب والنبيين، وآتى المال على حبّه ذوي القربى واليتامى والمساكين وابن السبيل والسائلين وفي الرقاب وأقام الصلاة وآتى الزكاة، والموفون بعهدهم إذا عهدوا، والصابرين في البأساء والضرّاء وحين البأس، أولئك الذين صدقوا وأولئك هم المتقون﴾البقرة/١٧٧. واتە: چاکە ئەوە نییە کە ڕوو بکەنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەڵکو چاکە چاکەی کەسێکە کە:

أ - بڕوای ببێت بە خوا، بە ڕۆژی دوایی، بە فریشتە، بە نامە ئاسمانییەکان، بە پێغەمبەران.
ب - دارایی خۆی ببەخشێت، -لەگەڵ ئەوەی کە خۆشی دەوێت- بە خزمان و هەتیوان و بێ نەوایان و ڕێبواران و سواڵکەران، وە لە ڕێی ئازاد کردنی کۆیلەیەکدا.
ج - نوێژ بکات و زەکات بدات.
د - پەیمان بەجێهێنەران کاتێ پەیمان دەدەن.
هـ- خۆڕاگران لەکاتی تەنگدەستیو نەخۆشی و دەمی جەنگدا، ئەوانەن کە ڕاستیان کردووەو هەر ئەوانەن کە پارێزکارن.

(٣) ﴿قل أءنبّئكم بخير من ذلكم للذين اتقوا عند ربهم جنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها أبدا، وأزواج مطهّرة ورضوان من ا لله وا لله بصير بالعباد، الذين يقولون: ربّنا آمنّا فاغفر لنا ذنوبنا وقنا عذاب النار، الصابرين والصادقين والقانتين والمنفقين والمستغفرين بالأسحار﴾آل عمران/١٧.

لەم پێناسانەدا ئەم سیفەتانەی پارێزکاران دەردەکەوێت:

أ - داوای لێخۆش بوون دەکەن بۆ گوناهەکانیان.
ب - داوای پاراستن دەکەن لە سزای دۆزەخ.
ج - ئارامگرن.
د - ڕاستگۆن.
هـ- خاوەن عیبادەتن و گوێڕایەڵ و ملکەچی فەرمانی خوان.
و - ماڵ و سامانیان بەخت دەکەن.

(٤) ﴿وسارعوا إلى مغفرة من ربّكم وجنّة عرضها السموات والأرض أعدّت للمتقين: الذين ينفقون في السرّاء والضرّاء والكاظمين الغيظ والعافين عن الناس وا لله يحب المحسنين، والذين إذا فعلوا فاحشة أو ظلموا أنفسهم ذكروا ا لله فاستغفروا لذنوبهم ومن يغفر الذنوب إلاّ ا لله ولم يصرّوا على ما فعلوا وهم يعلمون، أولئك جزائهم مغفرة من ربّهم وجنات تجري من تحتها الأنهار خالدين فيها ونعم أجر العاملين﴾آل عمران/١٣٣..

لەم پێناسەیەشدا ئەم سیفەتانەی پارێزکاران دەردەکەوێت:

أ - ئەو کەسانەی ماڵی خۆیان بەخت دەکەن لەڕێی خوادا لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا، لە کاتی هەرزانی و گرانیدا.
ب - ڕق و دڵگرانی خۆیان دەخۆنەوەو دەری نابڕن.
ج - لە خەڵکی خۆش دەبن لەکاتێکدا ناهەقییەک بەرامبەریان بکرێت.

د - هەمیشە هەست بە چاودێری خوا دەکەن و شەرمی لێ دەکەن.
هـ- ئەگەر کارێکی خراپ و ناڕەوایـان لێ وەشایەوە یـان زوڵمیـان لە نەفسی خۆیـان کـرد، وە دەسەلات و گەورەیی خوایان هاتەوە یاد پەشیمان دەبنەوەو دوای لێبووردن لەخوا دەکەن و سوورنابن و نامێننەوە لەسەر گوناهـ کردن.
(٥) ﴿ولقد آتينا موسى وهارون الفرقان وضياءً وذكرى للمتقين، الذين يخشون ربّهم بالغيب، وهم من الساعة مشفقون﴾الأنبياء/٤٨.
ئەم پێناسەیە دوو سیفەتی پارێزکاران باس دەکات:
أ - ئەو پارێزکارانە کەسانێکن کە سام دەکەن و دەترسن لە پەروەردگاریان لە پەنهانیداو بەبێ ئەوەی بە چاو بیبینن.
ب - وە کەسانێکن لە ڕۆژی دوایی دەترسن.
(٦) ﴿إنّ المتقين في جنات وعيون آخذين ما آتاهم ربّهم، إنهم كانوا قبل ذلك محسنين، كانوا قليلاً من الليل ما يهجعون، وبالأسحار هم يستغفرون، وفي أموالهم حقّ معلوم للسائل والمحروم﴾الذاريات/١٦.
هەروەها سیفەتەکانی پارێزکاران لەم پێناسەیەدا بریتییە لە:
أ - لەکارو کردەوەیاندا هەمیشە هەستیان بە چاودێریی خوا کردووەو شەرمیان کردووە لێی.
ب - شەو خەریکی عیبادەت دەبوون و کەم دەنوستن.
ج - لە بەرەبەیاندا داوای لێخۆشبوونیان دەکرد لەخوا.
د - لە ماڵ و سامانیان بەشی هەژارو بێ ئەوایانیان دەدا.
(٧) ﴿إنّ الذين اتقوا إذا مسّهم طائف من الشيطان تذكّروا فإذا هم مبصرون﴾الأعراف/٢٠٧. ئەوانەی کە پارێزکارن ئەگەر خەیاڵێک لە شەیتانەوە لێیان بدات و پاڵیان پێوە بنێت بۆ هەوادانیان، گورج بیری خوای پەروەردگاریان دەکەنەوەو پەنای بۆ دەبەن، خواش زوو حاڵیان چاک دەکات و وایان لێ دەکات ڕێی ڕاست ببینن.
ئەم حەوت پێناسەیە زۆربەی زۆری سیفەتەکانی پارێزکارانی تێدایە، جا دەبێ بڕوادار چاویان لێبکات و هەوڵ بدات بیکاتە سەرمەشقی ژیانی خۆی، تا بگاتە ئەو پلە بەرزە، پلەی پارێزکاران..

### ڕێگاکانی گەیشتن بە تەقوا :

## ڕێگای یەکەم/ وردبوونەوە لە قورئان :

أ - ﴿وكذلك أنزلناه قرآناً عربياً وصرّفنا فيه من الوعيد لعلّهم يتقون، أو يحدث لهم ركزاً﴾طه/١١٣. واتە: تا بەو جۆرە قورئانمان ناردۆتە خوارەوە بە زمانی عەرەبی و خەڵکیمان ترساندووە لە سزای دۆزەخ ، بەڵکو بترسن و خۆیان بپارێزن لە گوناه و تاوان، یان قورئان فەراهەم بێنێت لە دڵ و دەروونیاندا پەندو ئامۆژگاری و بیرکردنەوەیەک پێش ئەوەی دوچاری سزای ڕۆژی قیامەت ببن.
ب - ﴿وأنّ هذا صراطي مستقيماً فاتبعوه ولا تتبعوا السبل فتفرّق بكم عن سبيله ذلكم وصّاكم به، لعلّكم تتقون﴾الأنعام/١٥٣. واتە: ئەمانە کە لە قورئاندایە ڕێگای ڕاستی منن، ئێوە پەیڕەویان

بکەن، وە مەکەونە شوێنی هەواو ڕێگای جیاجیای تر، چونکە ئێوە دوور دەخاتەوە لە ڕێگای ڕاستی خوا، ئەم ئامۆژگاریانەمان کردوون، بەڵکو خۆتان بپارێزن لە گوناه و سزای خوا.

کەواتە خوێندنەوەی قورئان و تێگەیشتنی و پەیڕەوی کردنی دەبێتە هۆی دروست بوونی تەقوا.

## ڕێگای دووەم / خزمەت کردن و هەوڵ و تێکۆشان لە پێناوی خوادا:

﴿والذين اهتدوا زادهم هدىً وآتاهم تقواهم﴾محمد/١٧، واتە: ئەو کەسانەی کە شارەزای حەقیقەت بوون، خوا شارەزاییان زیاتر دەکات و، ترس و خۆپاراستنی ناو دڵیان دەداتێ.

لەم ئایەتەوە دەردەکەوێت کە تەقواو هیدایەتی زیاتر لەپاش هیدایەت دەبێت، وە هیدایەتیش پێویستی بە هەوڵێک هەیە کە دەبێت ئەو کەسە هەوڵی بۆ بدات، تا دەگاتە ڕاستی ﴿والذين جاهدوا فينا لنهدينّهم سُبُلنا﴾العنكبوت/٦٩. واتە: ئەوانەی هەوڵ دەدەن لەبەر ئێمە، هیدایەتیان دەدەین بۆ ڕێگاکەمان. وە هیدایەتیش نابێت مەگەر بە پەیڕەوی کردنی قورئان. جا ڕێنمایی خوداش لە ئیمانەوە دەست پێ دەکات ﴿ومن يؤمن با الله يهد قلبه﴾التغابن/١١، واتە هەرکەسێک بڕوا بێنێت بە خوا ڕێنمایی دڵی دەکات.

کەواتە هەوڵدان دەبێتە هۆی ئیمان و ئیمانیش دەبێتە هۆی هیدایەت و ئەویش دەبێتە هیدایەتی زیاترو تەقوا.

## ڕێگای سێیەم / بە ڕۆژوو بوون:

﴿يا أيها الذين آمنوا كتب عليكم الصيام كما كتب على الذين من قبلكم لعلكم تتّقون﴾البقرة/١٨٣. واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە ڕۆژووتان لەسەر فەرز کرا، هەروەک چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە فەرز کرابوو بەڵکو ببێتە مایەی پارێزکاریتان. کەواتە ڕۆژوو کە زاڵ بوونە بەسەر هەواو ئارەزوودا ڕێگەیەکە بۆ گەیشتن بە تەقوا.

## ڕێگای چوارەم / عیبادەتکردنی خوای گەورە:

﴿يا أيها الناس اعبدوا ربّكم الذي خلقكم والذين من قبلكم لعلّكم تتقون﴾البقرة/٢١. واتە: ئەی مەردوم ئەو خوایەی خۆتان بپەرستن کە ئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەی دروست کردوە، بەڵکو بەو پەرستنە بگەنە تەقوا.. کەواتە خواپەرستی بەگشتی ڕێگەیەکە بۆ گەیشتن بە پارێزکاری.

بەڵێ.. پارێزکاریش مروڤ دەگەیەنێتە پلەی (شوکر) کە بەرزترین پلەیە لە ئیسلامدا ﴿فاتقوا الله لعلّكم تشكرون﴾آل عمران/١٢٣، وە کەسانێکی کەمیش هەمن دەگەنە ئەو پلەیە ﴿وقليل من عبادي الشكور﴾السبا/١٣، پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە شەونوێژی کرد تا ئاوی پێی داهات، کە خەدیجە پێی وت: بۆچی ئەوەندە شەونوێژ دەکەیت و خۆت ماندوو دەکەیت، فەرمووی: (افلا اكون عبدا شكورا) بوخاری و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە.

هەروەها یەکەم ئامۆژگارییەک کە پێغەمبەری خوا بە مەعازی کوڕی جەبەلی فەرموو- پێش ئەوەی بینێرێت بۆ یەمەن: (اِتّق الله حيث ما كنت...)، واتە: لەهەرکوێ بوویت لەخوا بترسەو پارێزکاربە.. صحيح جامع الصغير للألباني رقم الحديث/٩٧.

جا پێویسته لەسەر موسڵمان له هەموو کات و شوێن ژ حاڵەتێکدا لەخوا بترسێ و پابەند بێ به ئایینەکەیەوە، چونکه خوای گەورە شایستەی ئەوەیە کە لێی بترسین.. قورئان دەفەرموێ: ﴿هو أهل التقوى وأهل المغفرة..﴾ القيامة/٥٥.

له کۆتاییدا دەڵێین ئەگەر بمانەوێ بچینه ڕیزی (متقین)ەوە پێویسته له ژیانی ڕۆژانەماندا پابەندبین به ئایینی ئیسلامەوەو هەوڵ بدەین سنوورەکانی خوا نەشکێنین.

# دڵسۆزی

**پێشەکی :**

موسڵمان پێویستە لەهەموو هەڵس و کەوت و کارو کردەوەو قسەو گوفتارێکیدا رەچاوی دوو مەرجی سەرەکی بکات بۆ ئەوەی خوای گەورە سەرجەم هەوڵ و تێکۆشانەکانی بە عیبادەت بۆ بنوسێت و قبوڵیان بکات :

یەکەم : بەدڵسۆزیی و لەبەر رەزامەندی پەروەردگار بێت.

دووەم : بەپێی بەرنامەو شەریعەتی ئیسلام بێت.

لە قورئاندا لە زۆر جێگادا خوایگەورە ئەم دوو مەرجە بیری موسڵمانان دەخاتەوەو دەیان ترسێنێ لە فەرامۆشکردنی ئەو مەرجانە:

- ﴿فمن كان يرجوا لقاء ربه فليعمل عملا صالحا ولا يشرك بعبادة ربه أحدا﴾ الكهف/١١٠.
- ﴿الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم أحسن عملا﴾. الملك/٢.
- ﴿وما أمروا إلا ليعبدوا الله مخلصين له الدين﴾. البينة/٥ .
- ﴿إنا أنزلنا إليك الكتاب بالحق فاعبدالله مخلصا له الدين ألا لله الدين الخالص﴾ لزمر/٢ .

لە رووی زمانەوانیەوە (دڵسۆزیی- الإخلاص) بە شتێک دەگوترێت کە پاک کرابێتەوە لە خلتە.. قورئان سەبارەت بە شیری گیانداران دەفەرموێت: ﴿من بين فرث ودم لبنا خالصا سائغا للشاربين﴾ النحل/٦٦.

پاکژ (خلوص)ی شیر ئەوەیە کە خڵتەی پێوە نەبێت لە خوێن یا ژەک .

لە رووی زاراوەییشەوە (إخلاص) چەند واتایەکی هەیە کە سەرەنجامەکەی ئەمەیە:

دەبێ بەندە لە هەموو کارو کرداروو هەڵس وکەوتی و تێکۆشانێک کۆشش بێت لە پێناو رەزامەندیی خوای گەورەدا ئەنجام بداو هیچ نیازو مەبەستێکی دنیایی چاو لێوەنەبێت لە رووی پلەو پایەو دارایی و ناوبانگ و چوونەپێش و خستنەدواوەو.....هتد، خوای گەورە دەفەرموێت: (قل إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين) الأنعام/ ١٦٢.

دڵسۆزیی نهێنیەکە لە نێوان خواو بەندەکەیداو هیچ کەسێکی تر پێی نازانێت تەنانەت پێغەمبەران و فریشتەگەورەکانیش، (فضیل)ی کوڕی (عیاض) دەفەرموێ: وازهێنان لە کردەوە لەبەر خەڵکی ریاو رووپاماییەو کارکردنیش لەبەر خەڵکی شیرکە، مەگەر اخلاص و دڵسۆزی لەهەردوو دەردەکە بتپارێزێ.

جا زانایان دەربارەی ئەو کردەوانەی کە ڕوپامایی و ریایی تێکەڵاوە دەڵێن چەند شێوەی هەیە:

أ – ئەو کەسەی ریابازیەکەی زیاتر بێت لە دڵسۆزییەکەی ئەوا کردەوەکانی دەبنە مایەی قین و خەشمی پەروەردگار (پەنا بە خوا)، نموونەی ئەمەش (قزمان)ە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( ئەو لە دۆزەخدایە) لە کاتێکدا ئەم پیاوە لەجەنگی (احد)دا کوشتارێکی زۆری لە بێبڕواکان کردو نزیکەی (٨) کەسی لێکوشتن، زۆر نازاو چاونەترس بوو، تەنانەت موسڵمانان

پێیان دەگوت: بەخوا ئەمڕۆ (قزمان) دەست ناپارێزێت و دوژمنانی تەفروتونا کردووە مژدەمان بدەرێ..! بەڵام نیازی دڵی دەرکەوت کاتێک گوتی: بەخوا لەبەرخاتری ناوداریی هۆزەکەم نەبوایە ئەوەم نەدەکرد!! کاتێک زامەکانی پەرێشانی کرد خۆی کوشت..! (تهذیب السیرة ج٢ص٨٨).

ب - ئەگەر خاوەن کارەکە دڵسۆزیی‌و ریابازییەکەی یەکسان بوو ئەوا نە پاداشتی هەیە لای خوای‌گەورەو نە سزا، پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کرد پلەی کەسێک چۆنە کە لە پێناو خوادا دەجەنگێت، پاداشتی لای خواهەیەو بیەوێت خەڵکیش باسی بکەن؟

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ پاداشتێکی نییە، خوای‌گەورە هیچ شتێک وەرناگرێت جگە لەوەی کە تەنها لەبەر رەزامەندی ئەو کراوە) رواه النسائي بإسناد حسن.

ج - ئەگەر خاوەن کارەکە دڵسۆزییەکەی زیاتر بوو لە ریابازییەکەی ئەوا پاداشتی دەدرێتەوە بەپێی ئەو برە دڵسۆزییەی کە لە ریاییەکەی زیاترە ﴿فمن يعمل مثقال ذرة خيرا يره ومن يعمل مثقال ذرة شرا يره﴾ الزلزلة/٨.

## دڵسۆزیی بۆچی ؟

یەکەم/ پێویستە هەموو کارەکانمان بەدڵسۆزییەوە ئەنجام بدرێن و لەبەرخاتری رەزامەندی خوای گەورە بێت، چونکە دڵسۆزیی لە کاردا وەک رۆح وایە لەلەشدا، زاناکان لەم بارەیەوە دەڵێن:

کەسێک کەلەگەڵ خێزان یان خۆشەویست و هاورێی هاودەمەکەیدایەو ماوەیەکی زۆر پێکەوە دەژین، جا ئەگەر لەناکاو گیانی دەربچێت ئایا دەتوانێت وەک جاری جاران هاودەمی بێت و لەگەڵیا بژی لەکاتێکدا شێوەو روخسارو دیمەنی نەگۆڕاوە بەڵکو تەنها گیانی تێدانەماوە، نەک هەر تێکەڵاویی ناکات بەڵکو هەتا دەتوانێت لێی دوور دەکەوێتەوەو دەترسێت و حەز لە چاوەری ناکات و پەلەی ئەوەیەتی زوو بە خاک بسپێرێت.

کارو کردەوەش هەروایە ئەگەرچی بەرواڵەت و دیمەن جوان و گەورە بێت کە دڵسۆزیی تێدا نەبێت لە رۆژی قیامەتدا پیس و چارەگران و ناکۆک و ناشیرینەو دەدرێتەوە بەرووی خاوەنەکەیداو وەرناگیرێت، پێی دەوترێت: ( پاداشت لای ئەو کەسەیە کە کارت بۆ کردووە.

دووەم/ پێویستە دڵسۆزبین لە کارو کردەوەکانماندا تاکو رەنجەڕۆی رۆژی دوایی نەبین وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( یەکەمین کەسێک کە رۆژی دوایی دادگایی‌دەکرێت ئەو کەسەیە کە شەهید بووە، شەهیدیەکەی بۆ دەهێنرێتەوەو رووبەرووی رادەوەستێت و دەیناسێتەوە، خوای گەورە پێی دەفەرموێت:

+ چیت کردووەو مەبەستت چی بووە ؟

ئەویش دەڵێت:

- کوشتارم لە دوژمنان کرد هەتا شەهید کرام .

خوای گەورە پێی دەفەرموێت:

درۆت کرد! بەڵکو لەپێناو ئەوەدابوو کە پێت بڵێن ئازاو چاونەترسە.. پاشان فەرمان دەدرێت و بەروویدا دەدرێتەوەو لەسەر سنگ رادەکێشرێتە ناو دۆزەخەوە.

دووەم کەسیش ئەو کەسەیە کە قورئان فـێربووەو خـەڵکیش فێردەکـات و دەیخوێنێـت، لـەو ڕۆژەدا کردەوەی بۆ دەهێنرێتەوەو یەکتری دەناسنەوەو خوایگەورە پێی دەفەرموێت:

+ چیت کردووەو مەبەستت چی بووە ؟

ئەویش دەڵێت:

- فێری زانیاری بووم و خەڵکم فێر کردووەو لەبەر خاتری تۆ قورئانم خوێندووە!

خوای گەورە پێی دەفەرموێت:

- درۆت کرد! بەڵکو بۆ ئەوە دەتخوێند تاکو پێت بڵێن زاناو قورئان خوێنـە، ئنجـا فـەرمان دەدرێـت و بە ڕوویدا دەدرێتەوەو لەسەر سنگ ڕادەکێشرێت بۆ ناو دۆزەخ !

سێهەم کەسیش ئەو کەسەیە کە خوایگەورە ماڵ و دارایی پێداوە لەو ڕۆژەدا دێتەوە بۆ لای یەکتر دەناسنەوەو خوایگەورە پێی دەفەرموێت :

+ چیت کردووەو مەبەستت چی بوو ؟

ئەویش دەڵێت :

- هیچ شتێک نەبوو کە هاتبێتە ڕێگەم و پێویستی بە هاوکـاری مـن بووبێـت و فەرامۆشـم کردبێت مەگەر هەر بەشداریم تێداکردووە لەبەر خاتری تۆ.

خوای گەورە پێی دەفەرموێت :

+ درۆت کرد بـەڵکو مەبەسـتت ئـەوەبوو کـە پێـت بڵێـن بەخشـندەو دڵ فراوانـە، فـەرمان دەکرێت و لەسەر سنگ ڕادەکێشرێتە ناو دۆزەخ ) -رواه مسـلم-

**ئایا کاریگەریی و تینی دڵسۆزیی چۆنە کاتێک لەبەندەدا ڕەنگ دەداتەوە؟**

یەکەم: خۆ لەبیرچوونەوە: مرۆڤـی دڵسـۆز هـەموو مەبەسـتێکی ڕەزامـەندی پـەروەردگارەو هەمیشە بیر لەوە دەکاتەوە کە چۆن ئەو کـارە بکـات تـاکولێی وەربگـیرێ و لـە ڕۆژی قیامـەتدا نەدرێتەوە بەسەریا.

زانایان سـەرنجی ئـەو (حدیـث)ەیـان زۆر داوە کـاتێک کـە پرسـیارکرا لـە پێغەمبـەر ﷺ سەبارەت بە ژمارەی پێغەمبەران، ئەویش فەرمووی: سەدو بیست و چوار هەزارن و سـەدو پـازدە لەوانە (رسل)ن ، احمد ڕیوایەتی کردووە.

کەچی لە قورئاندا تەنها ناوی (٢٥) پێغەمبەر هاتووە بە (نبی) و (رسول)ەوە، ئەی ئەوانی تر بۆچی ناویان نەبراوە ؟

خوای گەورە دەفەرموێت : ( منهم من قصصنا علیك ومنهم من لم نقصص علیك) تەنانـەت لەهەندێک شوێندا خوایگـەورە بـێ ئـەوەی ناویـان بـەرێ باسـی ئـەو پێغەمبەرانـەو گـەلێک لـە بانگخوازانی کردووە لەوانە (إنهم فتیة آمنوا بربهم فزدناهم هدی) ئەوانـە کێـن؟ ناویـان چییـە .. ؟ نازانین.

هەروەها لە نموونەیەکی تـردا خوایگـەورە لـە باسـی کۆمـەڵێکی خوانـاسدا دەفەرموێـت: (واضرب لهم مثلا اصحاب القریة إذ جاءها المرسلون ) با بپرسین ئەوانە کێن ..؟ ناویان چییە..؟ ئـەو گوندە کوێیە؟

نازانین.. هۆی ئەمەش ئەوەیە خوایگەورە دەیەوێت فێرمان بکات کە:

١- بۆ ئەوەی خۆنەویست بین و هەمیشە مەبەستمان ڕەزامەندیی خوا بێت و ناوو ناوبانگمان لا گرنگ نەبێت.
٢- کارو کردەوە بنەڕەت و بنچینەیە نەک ناوی کەس و شوێنەکان، گرنگیدان بە کاروکردەوە نەک بەدواداچوون و قووڵ بوونەوە لە ناوو جێگاو ژمارەکاندا.
٣- ناونەبردنیان دڵدانەوەو سەرەخۆشیە بۆ هەموو سەربازێکی نەناسراو کە دەشێت تۆی بەڕێزیش یەکێک بیت لەوانە، با نمونەیەکی ئاشکرا لەسەر ئەو پەروەردەکردنە بهێنینەوە:
(مسلمەی کوڕی عبدالملک) یەکێک بوو لەو سەربازانەی کە گەمارۆی قەڵایەکی سەختی ڕۆمەکانیان دابوو، چوونە ناو قەڵاکە زۆر زەحمەت بوو، سا مەگەر کەسێک کونی تێبکات و ئەو بەردە لابەرێت کە پێشی زێرابی قەڵاکەی گرتبوو.(مسلمە) لەبەردەم سوپاکەدا وەستاو گوتی:
+ کێ دەچێتە ئەو کونەوەو ئەو بەردە گەورەیە لادەدات و ڕێگەی چوونەژوورەوە دەکاتەوە؟
یەکێک لە سەربازەکان کە ڕووی خۆی بە جامانەیەک داپۆشیبوو هاتە پێشەوەو گوتی:
- من دەچم ..
چووە ناوەوەو بەردەکەی لاداو ڕێگەی کردەوەو سەربازەکان چوونە ژوورەوەو قەڵاکەیان گرت، پاشان (مسلمە) بانگی سەربازەکانی کردو گوتی:
+ کێ بوو کە کونەکەی کردە قەڵاکە ؟
کەس وەڵامی نەدایەوە، تاکو سێجار ئەم بانگەوازەی کرد هەر وەڵام نەبوو، ئینجا (مسلمە) گوتی:
+ تکایە هەرکەسێکە با ئەمشەو بیە لام جا گرنگ نییە لەهەرکاتێکی شەودا بێت یان ڕۆژ . شەوداهات و درا لە دەرگای ژووری (مسلمە) چوو بیکاتەوەو پرسی: کێیە؟
وتی : پێت نالێم من کێم هەتا سێ مەرجم بۆ نەهێنیتە دی .
مسلمە وتی : فەرموو.
کابراکەش وتی: من ئەو کەسەم کە کونەکەم کردە قەڵاکەو مەرجەکانیشم ئەمانەن:
(١) ناوم لای کەس نەبەیت و ئەم هەواڵە نەگەیەنیتەوە بە خەلیفەی موسڵمانان.
(٢) هیچ جۆرە خەڵاتێکم پێ نەبەخشیت .
(٣) بەچاوێکی جیاوازو تایبەتی سەیرم نەکەیت لەناو سەربازەکانی تردا.
ئەمەش چونکە ئەم سەربازە لەبەر خاتری خوایگەورە کارەکەی ئەنجام داوەو نایەوێت کەس بزانێت، مەبەستیش ئەوە نییە کە لەکاتی کردنی هەموو چاکەیەکدا دەمامک ببەستین بەڵکو با نیازو مەبەستی دڵمان تەنها ڕەزامەندی خوا بێت و دووربێت لە ڕیابازی.. ئیتر (مسلمە) لە دوعاکانیدا هەمیشە دەپاڕایەوە لە خوایگەورەو دەیفەرموو: (اللهم احشرني مع صاحب النقب) واتە: خوایە لەگەڵ ئەو سەربازە دەم بەسراوە حەشرم بکەیت) -قبسات من حياة الرسول- احمد عساف ص٨١.
دووەم : کاتێک دڵسۆزیی بوو بە هەوێنی تێکڕای کارەکانمان ئیتر چاوەڕوانی ستایش کردن و پیاهەڵدان ناکەین یان ڕەزامەندیی خەڵکیو پێچەوانەکەیو ئەمانە بایەخ و بەهایەکی ئەوتۆیان نییە!

سێیەم: ئەگەر بەتەواوەتی (اخلاص) پیادە بکرێت ئەوا جیاوازی لە نێوان موسڵماناندا ڕوونادات لەکاتێکدا کارو مەبەستی هەموو لایەک ڕەزامەندی خوای گەورەیەو یەک ئامانج و مەبەستمان هەیەو یەک دوژمنمان هەیە، ئیتر بەڵگەهێنانەوە هەمەجۆرو بەهانەی شەرعی بۆ پاکانەی هەڵوێست و دوورلە سەرچاوەی قورئان و سوننەت هەڵەیەو فەتوای سەربەخۆ بەبێ بنچینەی زانست و قورئان و سوننەت ئاژاوەو پشێوی لەدوایە، لێرەدا مەبەستمان جیاوازی شێوازی بانگخوازیی نییەو ئەوەیان شتێکی ترە.

چوارەم : کاتێک دڵسۆزیی و بۆ خوا ژیان لەدڵدا دەچەسپێت ئیتر بە ئارەزووی خۆی هەنگاو نانێت و بازرگانی بە ئایینی خواوە ناکات و، هەر شێوازێکی (ترغیب و ترهیب) کە لەلایەن نەیارانیەوە بەکار دەهێنرێت دژی موسڵمان لە خشتەی نابات و نایترسێنێت و لە ڕاستە ڕێی کاروان نایترازێنێ.. بەڵام بە ئومێدی پاداشتی قیامەتەوە هەر ناڕەحەتی و ئازارێک کە لەپێناو گەیاندنی پەیامەکەی خوادا دێتە ڕێی جگە لەوەی ساردی ناکاتەوە بەڵکو بە سوننەتێکی خوایی دەزانێت و خۆی لە بەرابەر ئەو ناڕەحەتیانەدا دەگرێت .

زۆرکەسی بانگخواز هەبوون کە لەم جۆرە تاقیکردنەوانە دەرنەچوون و دواڕۆژی خۆیان دۆڕاند، ئەمەش شتێکی دوورو نامۆ نییە، خوای گەورە دەفەرموێت:

( واتل عليهم نبأ الذي آتيناه آياتنا فانسلخ منها فأتبعه الشيطان فكان من الغاوين).

(مالک) ی کوڕی (دینار) دەڵێت:

زانایەکی (بنی اسرائيل) هەبوو مەبەستی بانگخوازیی بەملاولادا دەیان ناردو ڕەوانەیان دەکرد، ئینجا (موسی) پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد بچێت بۆ لای پادشای (مەدیەن) تاکو بانگی بکات بۆ ڕێگەی خواناسی، بەڵام بەپێچەوانەوە هەڵگەڕایەوەو پشتی لە ئاینەکەی خۆی هەڵکرد. مختصر ابن كثير مجلد (٢) ص٦٥.

## کاتێک مرۆڤ دڵسۆز نەبێت چی بەسەر دێت ؟

١- مرۆڤ لە دوو باردا خۆی دەبینێتەوە بارێکیان پەیوەندی نێوان خۆیو خەڵک کە تیایدا هەمیشە چاکەکانی خۆی دەردەخات و خراپەکانیشی دەشارێتەوە، باری دووەمیش پەیوەندی نێوان خۆیو خوایە، کە تیایدا لایەنە خراپەکاریەکەی بەکاردەهێنیو حەقیقەتی دڵ و دەروونی دەردەکەوێت.

٢- کاتێک دڵسۆزیی نامێنێت تەنها شێوەو دیمەن و ڕواڵەت دەمووردەبینن و ناوەڕۆکە ڕۆحییە پاکەکە نامێنێت .

## ڕێگەکانی گەیشتن بە دڵسۆزیش ئەمانەن :

(١) **لەخۆپرسینەوە** : ئەوەیە کە پێش ئەوەی کارێک ئەنجام بدەین بەتەواوەتی نیازو نیەتی دڵمان بۆ خوا یەکلایی بکەینەوە. بۆ نموونە کاتێک پیاوچاکانی پێش خۆمان بانگ دەکران بۆ بەرێخستنی تەرمی موسڵمانێک یەکسەر ڕای نەدەکرد بەڵکو دەیگوت: کەمێک بوەستە با دڵم یەکلایی بکەمەوەو ڕووی پێ بکەمە پەروەردگار.

(٢) **خۆپەروەردەکردن** : یەکێک لە پێشەوایان دەڵێت: پێویستە نهێنییەک لەنێوان پەروەردگارو بەندەدا هەبێت، ئەگەر توانی با زیاتری بکات تا دەبێە نهێنییەکیتر ئەگەر توانی

با زیاتری بکات...هتد. تاکو چەندەها نهێنی لەنێوان خوای گەورەو ئەودا هەبێت تاکو ئەگەر کەوتە سەختڵەتیەوە بەو نهێنیانە لەخوای گەورە بپاڕێتەوە رزگاربوونی زۆر نزیکە، نموونەی ئەمەش ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ رووداوی ئەو سێ کەسەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە ئەشکەوتەکە گیردەخۆن و بەردێکی گەورە دەرگای ئەشکەوتەکەیان لێدەگرێت و پاشان بەو کارە نهێنییە چاکانە رزگاریان بوو کە پێشتر لەبەر رەزامەندی خوای گەورە ئەنجامیان دابوو

کاتێک (فضیل)ی کوڕی (عیاض) کۆچی دوایی کرد، خەونیان پێوە بینیو لێیان پرسی: خوای گەورە چی لێکردیت؟

گوتی: لەتاوانەکانم خۆش بوو..! گوتیان بەهۆی چییەوە؟ گوتی: سوێند بە خوا هیچ کردەوەیەکمان کەڵکی نەبوو، تەنها ئەو چەند رکاتە شەونوێژە نەبێت کە بەدڵسۆزانە ئەنجاممان دەدا.

# شەرمکردن (الحياء)

**شەرم لە زمانەوانی و زاراوەدا :**

لەزمانی عەرەبیدا (الحیاء) واتە: (شەرم) لە وشەی (الحیاة)ەوە وەرگیراوە واتە (ژیان)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ژیان شەرمی لێ جیا ناکرێتەوەو بە بێ شەرم سروشتی گوزەران کردن لەم ژیانەدا دەشێوێ و تێک دەچێت.

لە زاراوەشدا؛ زانایان دەڵێن: شەرمکردن بریتییە لە سەغڵەتی دڵ و دەروون و سڵەمینەوە لە شتی ناشیرین و نابەجێ.. یاخود دەڵێن: شەرم ئەوەیە کە نەهێڵێت خوای گەورە بتبینێت لە سەرپێچی ئەو فرمانانەی کە پێویستی کردوە لەسەرت و کەمتەرخەمی نەنوێنی لە بەجێهێنانی ئەرکەکانتدا.. شێخ جونەیدی بەغدادی (ڕەحمەتی خوای لێبێت) دەفەرموێ: ئەو حاڵەتەی کە بۆ مرۆڤ دروست دەبێت لە نێوان بینینی نیعمەتەکانی خوای گەورەو کەمتەرخەمی نواندن لە دەربڕینی سوپاس و ستایش لەسەر ئەو نازو نیعمەتانە پێی دەوترێت (شەرم).

جا مرۆڤ یان شەرم لە خوای گەورە دەکات یان لە خەڵک، خۆ ئەگەر ئەو کەسە لەم دوانە شەرمی نەکرد ئەوا لە ڕیزی ئینسان دەچێتە دەرەوە.. دکتۆر مصطفى السباعي لە کتێبی (هكذا علمتني الحياة)دا دەڵێت: ئەگەر دەروونت هاتە سەر ئەوەی ویستی گوناە و تاوانێکت پێ ئەنجام بدات ئەوا خوای گەورەی بخەرەوە بیر، ئەگەر سوودی نەبوو بیر لە شەرمەزاری دوایی ناو خەڵک بکەرەوە، ئەگەر هەر نەگەڕایەوە ئەوە بزانە کە زۆر لە مرۆڤ کەمترێت.

**جۆرەکانی شەرم :**

ابن رجب الحنبلي لە کتێبی (جامع العلوم والحكم) لاپەڕە(١٩٠) دەڵێت: شەرم دوو جۆرو حاڵەتە:

**جۆری یەکەم** : ئەو شەرمەیە کە هەر لە سەرەتاوە خوای گەورە وەکو بەخششێک لە ناخی کەسێکدا چاندوویەتی و کردوویەتی بە ڕەوشتێکی هەمیشەیی و چەسپاو تیایدا، ئەو کاتە هەموو قسەو ڕەفتارەکانی پڕ بەرەکەت دەبێ و لە هەموو کەس باشتر دەتوانێت خۆی دوورەپەرێز بگرێت لە گوناهو تاوان.. پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لەم بارەیەوە دەفەرموێ: (الحياء لا يأتي إلاّ بخير) متفق عليه.

**جۆری دووەم** : ئەو شەرمەیە کە مرۆڤ هەوڵ دەدات بەدەستی بهێنێت و لە خۆیدا بیهێنێتە دی و گەشەی پێ بدات، ئەمەش لە ڕێگای بە گەورە زانینی پەروەردگارو دڵنیا بوون لەوەی کە زاناو ئاگادارە بە هەموو کارو کردەوەکانی بۆی دروست دەبێت و، تێگەیشتن لە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزانە زیاتر ئیمانی بەرز دەکاتەوەو دەیگەیەنێ بە پلەی (احسان) کە بالاترین پلەی باوەڕە ﴿ألم يعلم بأنّ الله يرى..﴾العلق/١٤. ﴿..إنّ الله كان عليكم رقيبا﴾النساء/١.﴿يعلم خائنة الأعين وما تخفي الصدور..﴾غافر/١٩. ﴿ما يلفظ من قول إلاّ لديه رقيب عتيد﴾ق/١٨.. پێغەمبەریش ﷺ لەم بارەیەوە فەرموویەتی: (من استحيا من الله حقّ الحياء: فليحفظ الرأس وما وعى وليحفظ البطن وما حوى وليذكر الموت والبلا ومن أراد الآخرة ترك زينة الحياة الدنيا فمن فعل ذلك فقد استحيا من الله حق الحياء)رواه

الترمذي والحاكم بسند حسن وصححه الألباني، رقم الحديث ٩٣٥.. واتە: شەرمكردن لە خوای گەورە ئەوەیە كە بیرو هۆش و ئارەزووەكانی بپاریزێت لە گوناهو خراپەكاری و بیری كاتی مردن بكات، وە هەركەسێك پاداشتی رۆژی دوایی بوێت باواز لە زرق و برقی ئەم دنیایە بهێنێت، ئەوەی بەو جۆرە بكات بەراستی شەرمی لە پەروەردگاری كردوە.

**پەیوەندی نێوان شەرم و باوەڕ:**

- هەر لە پێغەمبەرە پێشینەكانەوە تا دوایین پێغەمبەر كە (محمد)ە ﷺ شەرم بەشێكی سەربەخۆو گرنگ بووە لە پەیامەكانیاندا بە پێی ئەم فەرموودانەی لای خوارەوە:

١- (الحياء من الإيمان والإيمان في الجنّة..)رواه الترمذي والحاكم وصحّحه الألباني رقم الحديث ٣١٩٩.. واتە: شەرم لە ئیمانە و ئیمانیش لە بەهەشتدایە..

٢- (الإيمان بضعة وستون شعبة والحياء شعبة من الإيمان)صحيح الألباني/ رقم الحديث ٢٨٠١.. واتە: باوەڕ شەست و ئەوەندە بەشەو شەرم لقێكە لە باوەڕ.

٣- (إنّ مما أدرك الناس من كلام نبوة الأولى إذا لم تستح فاصنع ماشئت)حديث صحيح واتە: ئەوەی كە خەڵكی لە فەرمایشتی پێغەمبەرە پێشینەكانەوە دەركیان پێ كردوە ئەوەیە كە ئەگەر شەرمت نەكرد هەرچیت دەتەوێ بیكە.

- شەرم تەنها باوەڕ دروستی دەكات، بەڵام ئەگەر كەسێكی دوور لەخوا بینرا كە شەرمدار بوو ئەوە یان هەر لە بنەڕەتەوە خوا ئەو خەسڵەتەی پێداوەو كاركردی خۆی هەیە لەسەر ژیانی ئەو كەسە، یاخود ئەو شەرمە مەبەستدارەو بە پێی كات و شوێن ڕەفتار و هەڵوێستەكانی گۆڕانی بەسەردا دێت و بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەكانی خۆی بەكاری دێنێ.. كەواتە ئەگەر شەرم ئیمان و باوەڕی ڕاستەقینە دروستی نەكات ئەوا ئەو ڕەوشتە دامەزارو نییەو گەشە ناكات.. بۆ نموونە: (جارێكیان پێغەمبەر ﷺ بەلای پیاوێكی (انصار)یدا تێپەڕ بوو كە ئامۆژگاری براكەی خۆی دەكرد تاكو شەرمدار بێت، كەچی پێغەمبەرﷺ فەرمووی: وازی لێ بێنە چونكە شەرم لە ئیمانەوەیە)موسلیم گێڕاویەتییەوە.

شەرم و باوەڕ هاوەڵی یەكن و لە یەكتر گرێ دراون و جیا نابنەوە، نەمانی یەكێكیان دەبێتە هۆی نەمانی ئەوی تریان، ئەوەتا پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (الحياء والإيمان قرناء جميعاً فإذا رفع أحدهما رفع الآخر) رواه الحاكم بسند صحيح و صححه الألباني/ رقم الحديث ٣٢٠٠..

كەواتە: شەرم یەكێكە لە ڕەوشتە بەرزەكانی ئیسلام و بەشێكی گرنگی باوەڕە، بەڵام شەرم و شكۆ هەرگیز ڕێ لە ئافرەتی موسڵمان ناگرێت كە هەوڵ نەدات بۆ فێربوونی زانست و زانیاری، یاخود ڕێ لەو ئیش و كارانە ناگرێت كە خوشكان بە هۆی زەرورەتی ژیانەوە دێنە دەرەوەو تێكەڵاوی ناو كۆمەڵ دەبن، بەمەرجێك سنوورە شەرعییەكان بپارێزن.. بۆ نموونە: شەرم ڕێی لە (ام سليم)ی (انصار)ی نەگرت بێتە خزمەت پێغەمبەری خواو ئەم پرسیارەی لێ بكات -كە باسی خۆشۆردنە لە (جەنابەت)و بە پێغەمبەری وت: (يا رسول الله إنّ الله لا يستحي من الحق فهل على المرأة من غسل إذا هي رأت الماء ؟ فيقول لها الرسولﷺ نعم إذا رأت الماء)رواه البخاري.. یان لە قورئاندا خوای گەورە باسی شەرم و شكۆی كچەكەی حەزرەتی شوعەیب (عليه السلام) دەكات كە باوكی ناردبووی بۆ لای حەزرەتی موسا: ﴿فجاءته إحداهما تمشي على استحياء قالت إنّ أبي يدعوك ليجزيك

أجر ما سقيت لنا﴾القصص/٢٥ واته: يەکێك لە کچەکان بە شەرم و شکۆوە دەڕۆیشت بە حەزرەتی موسای وت: باوکم بانگت دەکات بۆ ئەوەی پاداشتی ئەوەت بداتەوە کە ڕانەکەمانت تێرئاو کرد.
هەروەها پێویستە لەسەر موسڵمان سنووری بەکارهێنانی ئەم ڕەوشتە لە ژیاندا بزانێ و لە سنووری خۆی نەیترازێنێت، ئەگینا دەبیاتە حاڵەتێکی ترەوە کە لە شەرعدا زەم کراوەو خراپە، چونکە ئەو کەسە بەرەو سیفەتی (خجول) دەبات کە بێگومان خەسڵەتێکی خراپەو وا لەو کەسە دەکات کە لەسەر حەق نایەتە جواب..

**بەرهەم و خەسڵەتەکانی شەرمداری:**

(١) ئەگەر مرۆڤ شەرمدار بوو هەموو ڕەوشتە باش و چاکەکانی تریشی تێدا گەشە دەکات (ابن القيم) لە کتێبی(مفتاح دار السعادە)دا دەڵێت: شەرمداری گەورەترین و باشترین ڕەوشتی مرۆڤە و سەرچاوەی هەڵقوڵانی ڕەوشتەکانی تریەتی، بۆ نموونە: منداڵ بە هۆیەوە گوێڕایەڵی باوك و دایکی دەبێت، خاوەن ماڵ ڕێز لە میوان دەگرێت، پەیماندار بە تەنگ بەڵێنەکەیەوە دێت.. بە پێچەوانەوە ئەگەر مرۆڤ بێ شەرم بوو ئەوا هەمیشە بێ قەدرو ڕێز تەماشا دەکرێ و کەسێتیی زۆر دادەبەزێت، چونکە بەتەنگ هەست و ئەستی کەسانی ترەوە نایەت و ڕەوشتی نزمەو ڕەفتاری ناشیرینە و هەرچی بکات بە عەیب و ناڕەوای نازانێت و دەچێتە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە پێغەمبەرﷺ دەربارەیان دەفەرمووێ: (إذا لم تستح فاصنع ما شئت).
(٢) مرۆڤی خاوەن شەرم ئابڕووی بەرزو داوێن پاکە، وە بەرپێزەوە دەڕوانێتە ئافرەتانی ترو هەموویان بە خوشکی خۆی دادەنێ، هەرگیز تاوانی زایەندیی لێ ناوەشێتەوە، چونکە بە گەورەترین گوناهی دەزانێت هەر وەکو پێغەمبەرﷺ لە فەرموودەدا ئاماژەی بۆکردووەو فەرموویەتی: (ما من ذنب أعظم عند الله من نطفة يضعها رجل في رحم لا يحلّ له﴾ متفق عليه.
(٣) یەکێکی تر لە خەسڵەتەکانی شەرمداری ئەوەیە هەتا بۆی دەکرێ عەورەتی خۆی لە چاوی نامەحرەم دەپارێزێ؛ تەنانەت ئەگەر بە تەنیاش بێت شەرم لە خوای خۆی دەکات.
(٤) مرۆڤی شەرمدار نهێنی ژن و مێرد ئەپارێزێ و نایباتە دەرەوەو لای هیچ کەس باسی ناکات، چونکە گێڕانەوەکەی وەکو ئەوە وایە ئەو خەڵکە لە نزیکەوە هەڵسوکەوتی ئەو ژن و مێردە ببینن.
لە کۆتاییدا هیواداریـن خوای گەورە ئەو ڕەوشتە بەرزەمان پێ ببەخشێت و لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و پیاوچاکاندا کۆمان بکاتەوە.. آمین.

# پاداشت و ئادابی قورئان خوێندن

**پێشەکی:**

قورئانی پیرۆز هەرچەندە سەرەکی ترین ئامانج و مەبەست لە ناردنیدا بۆ پیادەکردن و کاریکردنیەتی لە ژیانی ڕۆژانەماندا؛ لەگەڵ ئەمەشدا داوامان لێکراوە وەکو یادخستنەوە و پەرستشێک لە خوای خۆمان نزیک ببینەوە و ڕۆژانە دەوری بکەینەوە.. ئەوەتە پەروەردگار ڕوو بە پێغەمبەرو هاوەڵان دەفەرموێت: ﴿فاقرؤا ما تيسر من القرآن﴾ المزمل/٢٠ .. واتە: ئەوەندەی بۆتان دەگونجێ و ئاسانە دەوری قورئان بکەنەوە.

قورئان وزەیەکی ڕوحییەو مانای ژیان دەبەخشێ.. نوور ڕووناکییەکە دڵ و دەروون ڕۆشن دەکاتەوە.. بەهۆی پابەندبوونمانەوە پێوەی چاوکراوە و ڕووناکبین دەبین بە کارو فرمانەکان..﴿..قد جاءكم من ا لله نور وكتاب مبين. يهدي به ا لله من اتبع رضوانه سبل السلام ويخرجهم من الظلمات إلى النور بإذنه ويهديهم إلى صراط مستقيم﴾١٥،١٦/المائدة.. هەروەها ئەگەر بەردەوام لە خزمەتیدا نەبین و دەوری نەکەینەوە بێگومان تووشی دابڕین و پچڕاندن دێین و ڕێنموونییەکانی خوامان بیر دەچێتەوە، چونکە ئەم قورئانە یادهێنەرو بێدارکەرەوەیەو مایەی ڕێنموونیی و هیدایەتە و دەستووری تەواوی ژیانە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ونزلنا عليك الكتاب تبياناً لكلِ شيءٍ وهدى ورحمةً وبشرى للمسلمين﴾النحل/٨٩. ﴿هذا بَصائرُ للناس وهدىً ورحمةً لقوم يُوقنون﴾الجاثية/٢٠.. واتە: ئەم قورئانە چاو و بینایە بۆ خەڵکی و هیدایەت و ڕەحمەتیشە بۆ ئەوانەی یەقینیان بە ڕاستیی بەرنامەکەمان هەیە..

جا پەیوەندیی نەمان بە قورئانەوەو دەور نەکردنەوەی نیشانەی تاریکی و خامۆشیی دەروونە و دەبێتە هۆی تێکچوونی تەرازووی چاک و خراپ و هەنگاوەکانمان لێ تێکدەچێ و، مانای ئەو فەرموودەیە دێتە دی کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (إن الذي ليس في جوفه شيء من القرآن كالبيت الخرب) رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح. واتە ئەو کەسەی شتێک لە قورئان لە دڵیا نەبێ وەکو خانووە ڕووخاوێک وایە تێکچووبێت بەسەر یەکتریدا.. بۆ ئەوەی ئەمە ڕوونەدات موسڵمان دەبێ پەیوەندیی پتەو بکات لەگەڵ قورئاندا و، هەر کاتێک هەستی بە ساردی و لاوازیی گیانیی کرد گورج دەست بکات بە خوێندنەوەی قورئان و وەک شیفایەک بەکاری بێنێ بۆ چارەی دەردەکانی، هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قد جاءتكم موعظة من ربكم وشفاء لما في الصدور﴾ يونس/٥٧.﴿ولننزل من القرآن ماهو شفاء ورحمة للمؤمنين﴾ الإسراء/٨٢.

هەروەها پێغەمبەرﷺ دەربارەی جیاوازی موسڵمانێ کە قورئان دەخوێنێ و دەوری دەکاتەوەو موسڵمانێ کە دەوری ناکاتەوە دەفەرموێت: (مثل المؤمن الذي يقرأ القرآن مثل الأتْرُجة ريحها طيب و طعمها طيب، ومثل المؤمن الذي لا يقرأ القرآن مثل التمرة لا ريح لها و طعمها حلوٌ..) رواه البخاري ومسلم.

واتە: نموونەی ئەو مسڵمانەی کە قورئان دەخوێنێت وەکو (ئەترۆجە) (پرتەقاڵ و مزرەمەنییەکان) وایە، بۆنی خۆشە چونکە ئەیخوێنێ و، تامیشی خۆشە چونکە کرداری پێ دەکات، وە نموونەی ئەو موسڵمانەی کە قورئان ناخوێنێ و بەینی نییە لەگەڵیا وەک خورما

وایە. بێ بۆنە کەچی تام شیرینە.

جا موسڵمان دەبێ هەمیشە هەوڵی باشترو چاکتر بدات و زیاتر خۆی نزیک بخاتەوە لە قورئان، چونکە یەکەم سەرچاوەی بەرنامەکەیەتی کە فەرمان و ڕێنموونی ژیانی لێ وەر بگرێ.

**ڕێزو پاداشتی قورئانخوێن :**

گومان لەوەدا نییە کە یەکێک لە گەورەترین و، پیرۆزترین کارێ کە موسڵمان لە خوای خۆی‌نزیک بخاتەوەو لیستەی کردەوە چاکەکانی پێ پڕبکاتەوە دەور کردنەوەی قورئانە، کەواتە خێرو پاداشتیشی هەر گەورەو زۆر دەبێ، لەوانە:

١- پێغەمبەرمان هەواڵی پێداوین کە خوێندنەوەی تەنها یەک پیت لە قورئان بە دە چاکەو بگرە زیاتریشمان بۆ دەنوسرێ: (من قرأ حرفاً من كتاب ا لله فله حسنة والحسنةُ بعشر أمثالها، لا أقول (ألم) حرفٌ ولكن ألف حرفٌ و لام حرفٌ و ميم حرف) رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح.

٢- خوای گەورە لە جەلال و بڵندی خۆیەوە بە پێویستی گێڕاوە کە ڕێز بگرێ لە قورئانخوێن، هەروەک پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێت: (إنّ من إجلال ا لله تعالى؛ إكرام ذي الشيبة المسلم وحامل القرآن غير الغالي فيه والجافي عنه وإكرام ذي السلطان المقسِط) رواه أبو داود وهو حديث حسن.

٣- لەکاتی کۆبوونەوە بۆ خوێندنەوەی قورئان و ورد بوونەوە لە ماناکانی بەزەیی و میهرەبانی خوا دەڕژێ بەسەریانداو فریشتەکانی گەڕۆک چواردەوری ئەو شوێنە دەدەن: (ما إجتمع قوم في بيت من بيوت ا لله يتلون كتاب ا لله ويتدارسونه بينهم إلاّ نزلت عليهم السكينة وغشيتهم الرحمة وحفّتهم الملائكة وذكرهم ا لله فيمن عنده)رواه مسلم.

٤- ئەوانەی ئەهلی قورئانن و هەمیشە لە خزمەتی‌دان و بە نیازی فێربوون و تێگەیشتنی هەوڵ دەدەن بە ئەهلی تایبەتی خوا دەدرێنە قەڵەم، ئەوە پێغەمبەرەﷺ دەفەرموێ: (أهل القرآن أهل ا لله و خاصّته)رواه النسائي وابن ماجة والحاكم بسند صحيح.

٥- چاکترین موسڵمان ئەو کەسەیە کە قورئان فێر دەبێ و خەڵکیش فێر دەکات: (خيركم من تعلّم القرآن وعلّمه)رواه البخاري.

٦- پێغەمبەرمان ئاماژەی کردوە کە ئەو کەسەی قورئانی زیاتری لە دڵدا بێت و چاکتر شارەزابێ ئەو ببێتە ئیمام و، لەکاتی مردنیشدا ئەم قەدرو ڕێزە هەر بەردەوام دەبێت، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا کە شەهیدەکانی غەزای (احد) کامیان زۆر قورئانی لە دڵا بوایە ئەویان دەخرایە پێشەوە لە گۆڕەکەدا.

٧- لە ڕۆژی قیامەتدا قورئان دێت بە هانای هاوەڵانیەوەو لای خوای گەورە تکایان بۆ دەکات: (إقرؤوا القرآن فإنه يأتي يوم القيامة شفيعاً لإصحابه)رواه مسلم. واتە: دەوری قورئان بکەنەوە چونکە لە ڕۆژی قیامەتدا شەفاعەت و سکاڵاخوازە بۆ ئەو کەسەی لە دنیادا خوێندویەتی‌یەوە.

٨- هەر کەس و نەتەوەیەک پابەند بێت بەم قورئانەوەو گوێڕایەڵی لە فەرمانەکانی خوا بکات، ئەوە لە دنیادا پلەی شکۆمەندی بەدەست دێنێ و بەعیززەتەوە دەژی، بەپێچەوانەشەوە ئەگەر گوێ بیستی ئایەتەکانی خوا نەبن و پشت هەڵبکەن لەم قورئانە بێگومان خوای گەورە زەلیل و زەبوونیان دەکات ، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (إنّ ا لله يرفع بهذا الكتاب أقواماً ويضع به آخرين)رواه مسلم.

٩- خوای گەورە پاداشتی باوانی قورئان خوێن دەداتەوەو ئەوانیش لەو خێرەدا بەشدار دەکات، چونکە بە خواناسی و موسڵمانێتی پەروەردەیان کردووە، هەروەک پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (من قرأ القرآن وعمِل بما فيه ألبسَ الله والِديه تاجاً يوم القيامة ضوءه أحسن من ضوء الشمس في بيوت الدنيا، فما ظنّكم بالذي عمِل بهذا..)رواه أبوداود وأحمد.

واتە : هەر کەس قورئان بخوێنێ و ئیش و کردار بە فەرمانەکانی بکات ، خوای گەورە لەو دنیا تاجێکی نورانی ئەکاتە سەری باوک و دایکی کە ڕۆشنایی‌یەکەی جوانترە لە ڕووناکی ڕۆژ، کاتێک کە خانوویەک ڕۆشن دەکاتەوە لە دنیادا، دەی کەواتە ئەوەی خۆی کاری پێ دەکات ئاخۆ چ جۆرە پاداشتێکی دەدرێتەوە!؟

١٠- پلەو پایەی قورئانخوێنی شارەزا ئەوەندە بەرزە خوای گەورە دەیخاتە ڕیزی فریشتە بەڕێزو پایە بەرزەکانەوە، ئەو موسڵمانەش بەهۆی زمانیەوە بەزەحمەت بۆی دەخوێنرێتەوە خوای گەورە دوو پاداشتی بۆ دەنووسێ: (الذي يقرأ القرآن وهو ماهرٌ فيه مع سفرة الكرام البررة والذي يقرأ القرآن ويتعتع فيه وهو عليه شاق له أجران)متفق عليه.

١١- قورئان خوێن بەردەوام لەبەهەشتدا پلەو پایەی بەرز دەبێتەوە، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: (يقال لصاحبِ القرآن إقرأ وارقَ ورتّل كما كنتَ ترتّل في الدنيا فإنّ منزلتك عندَ آخر آيةٍ تقرَؤها)رواه أبو داود والترمذي والنسائي وقال الترمذي حديث حسن صحيح. واتە لە بەهەشتدا بە قورئانخوێن دەوترێ بخوێنە هەروەک چۆن لە دنیادا بە تەرتیلەوە دەتخوێند چونکە پلەو مەنزڵت دوا ئایەت دیاری دەکا کە دەیخوێنی، کەواتە لەو ساتەوە کە موسڵمان دەور دەکاتەوە سۆزو میهرەبانی‌یەکە لە تەکیدایەو هاورێیەتی تا وەرگرتنی شوێن و مەقامی لە بەهەشتدا.

**چۆنێتی و شێوەی دەورکردنەوە :**

قورئان پێویستە بە شێوەیەک دەور بکرێتەوە بێدارو وریامان بکاتەوەو کارمان تێ بکاو پاشان گۆڕانکاریمان تیا دروست بکات و ، دڵمان بسرەوێنێ و تامەزرۆی ئایەتەکان بکەین تا ڕەحم و بەزەیی خوا بمانگرێتەوەو سام و ترسمان هەبێت لەو سزا سەخت و نەبڕاوەی کە خواوەند ئامادەو سازی کردووە لە دۆزەخدا بۆ ستەمکاران و بێ باوەڕان، بە مژدە دڵ ڕفێنەکانیشی شەوق و خۆشیمان پێ ببەخشێ، تا چالاکانە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بین، نەک تەنها خوێندنەوەیەکی بێ گیان و سارد بێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إنّ الذين يتلون كتاب الله وأقاموا الصلاة وأنفقوا مما رزقناهم سرّاً وعلانيةً يرجون تجارة لن تَبور، ليوَفّيهم أجورَهم ويزيدَهم من فضلِه إنّه غفورٌ شكور﴾فاطر/٢٩-٣٠. واتە: ئەوانەی بە وردی و تێگەیشتنەوە قورئان دەخوێننەوەو کار دەکاتە سەر هەڵسوکەوتیان و ، نوێژەکان ئەنجام دەدەن و لەو ڕزق و ڕۆزی‌یەی کە پێمان داون بە نهێنی و ئاشکرا دەیبەخشن و ئومێدیشیان هەیە کە بازرگانێتی‌یەکەیان بە هیچ سەیر نەکرێ و لای خوا وەربگیرێ، ئەوە خواوەند لە میهرەبانی و (فضل)ی خۆیەوە بەتەواوی و زیادەوە پاداشتیان دەداتەوە، هەر ئەوە لێبوردەیەو چاوپۆشی لە کەم و کورتیەکانی بەندەی خۆی دەکاو پاداشت بەخشیشە بەرامبەر بە سوپاس گوزاری‌یەکی کەمیان.

**ئادابی قورئان خوێندن :**

موسڵمان دەبێ لەکاتی دەورکردنەوەی قورئاندا ئەم ئاداب و مەرجانەی لای خوارەوە پەیڕەو بکات:

١- دەستنوێژی هەبێت و بە ئەدەب و ویقارەوە ڕوو بکاتە قیبلەو ئەگەر بۆی کرا سیواکیش بکا، ئینجا بە ملکەچی و خشوعەوە بیخوێنێتەوەو دنیا لە دڵ و هۆشی دەرکاو، لەوەو دوا بەگریان و فرمێسک ڕشتن لەگەڵ قورئانەکەدا ڕۆبچێ، ئەوەتە خوای گەورە باسی گوێگرتنی هەندێ لە (نصارى)ی کردووە بۆ ئەم قورئانەو دەفەرموێ: ﴿وإذا سمعوا ما أنزل إلى الرسول ترى أعينهم تفيض من الدمع مما عرفوا من الحقّ...﴾المائدة/٨٦. واتە : هەرکاتێ بە دڵ گوێیان لەو قورئانە بوایە کە بۆ پێغەمبەرﷺ هاتبووە خوارێ ئەت بینی چاوەکانیان فرمێسکی هەڵئەڕشت بەهۆی ئەو ڕاستی و حەقیقەتانەی کە لە ئایەتەکەدا بەدییان دەکردو کاری تێ دەکردن.. تەنانەت پێغەمبەر ﷺ کە خوای گەورە بە (سراجا منيرا) باسی فەرمووەو قورئانیش نورو ڕووناکیەکی ترە کە بۆی نێرراوە.: (ڕۆژێکیان بانگی عبداللەی کوڕی مەسعود دەکاو دەفەرموێ: قورئانم بۆ بخوێنە ، عبدالله وتی : من قورئانت بۆ بخوێنم و قورئانیش بۆ تۆ هاتووە ئەی پێغەمبەری خوا؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: پێم خۆشە لەکەسانی ترەوە گوێم لێی بێ.. عبداللە دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (النساء) هەتا گەیشتە ئایەتی: ﴿فكيف إذا جئنا من كلّ أمة بشهيدٍ وجئنا بك على هؤلاء شهيداً﴾النساء/٤١. بە بیستنی ئەم ئایەتە پیرۆزانە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ گریان زۆری بۆ هێناو فرمێسک لە چاوەکانیەوە ئەهاتنە خوارەوە، بۆیە ئیشارەتی کرد بۆ عبدالله کەوا ئیتر بەسە) بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.. جا موسڵمانیش هەمور کات هەوڵی ئەوە ئەدات کە پێغەمبەر ﷺ چۆن چۆنی ژیاوە لەگەڵ ئەم قورئانەدا بەو جۆرە بکاو بیکاتە ڕابەرو مامۆستای خۆی و یاوەرانیش لەبیر ئەکاو سەرنجی پیاوچاک و خواناسانیش بدات، بۆ نمونە جارێک حەزرەتی عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوێی لە قورئان خوێنێک دەبێ سورەتی (الطور)ی دەخوێند، کاتێ کە گەیشتە ئایەتی ﴿إنّ عذاب ربّك لواقع ما له من دافع﴾ لە تاوا خۆی بە دیوارێک گرتەوەو پاشان چووە ماڵەوە بۆ ماوەی مانگێک نەخۆش کەوت، هاوەڵانِ زیارەتیان دەکردو ئەیان دەزانی بۆچی نەخۆش کەوتووە.. وە یان کاتێ کە ئایەتی ﴿وإنّ جهنم لموعدهم أجمعين﴾ هاتە خوارێ، سەلمانی فارسی (خوا لێی ڕازی بێ) هاوارێکی کردو کێشای بەسەری خۆیدا. هەروەها (زرارە)ی کوڕی(اوفى) پێش نوێژی دەکرد بۆ موسڵمانان و سورەتی (المدثر) ی بۆ خوێندن تا ئایەتی ﴿فإذا نقر في الناقور فذلك يومئذٍ يوم عسير﴾ بڕی کردو هەناسەی سوار بوو و هەر لە نوێژەکەدا وەفاتی کرد (خوا ڕەحمی پێ بکا).

٢- پێویستە موسڵمان هەوڵ بدات لەکاتی خوێندنەوەیدا بگری و ئەگەر گریانیشی بۆ نەهات با زۆر لە خۆی بکات و ماتەمینی دایگرێ و هەناسەی شەرمەزاری هەڵکێشێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (أتلو القرآن وابكوا فإن لم تبكوا فتباكوا)رواه ابن ماجة باسناد جيد، واتە : قورئان بخوێنن و بگرین بەدەم خوێندنەوەکەوە، ئەگەر گریانتان نەهات بەزۆر بیهێنن بەسەر خۆتاندا. ئەو دڵەی کە ئایەتەکانی خوا دایئەچڵەکێنێ و کاریگەر نەبێ بۆی، لە لایەکێ ترەوە دەناڵێنێ و بەزوویی هەوڵی چارەی بدات.. ئەوەتە هەر عبداللەی کوڕی مەسعودە ئەفەرموێ:

(أطلب قلبك في ثلاث مواطن، عند سماع القرآن، وفي مجالس الذكر وفي أوقات الخلوة، فإن لم تجده في هذه المواطن فسل الله أن يمنّ عليك بقلبٍ فإنه لا قلب لك) واتە: دڵت ئامادە بکە لە سێ کاتدا: کاتی گوێگرتن لە قورئان و کاتی کۆڕی زیکر و لە کاتەکانی خەڵوەشدا، جا ئەگەر دڵت نەبینییەوە لەم کاتانەدا داوا لە خوای گەورە بکە دڵێکی ترت پێ ببەخشێ، چونکە ئەم دڵەت مردوەو لەکار کەوتوە.

بێگومان ئەم قورئانە هەموو دڵێکی تێگەیشتوو بە فام و هۆشدار ئەهێنێتە لەرزەو سام و ترسی هەڕەشەکانی دەروونی دائەگرێ و بەبەڵێنەکانی ئومێدو چاوەڕوانی پەیدا ئەکات، چونکە ئەو هێزو دەسەڵاتەی قورئان هەیەتی بەسەر دڵ و دەرووندا هیچ شتێک لەم جیهانەدا نییەتی، بۆ نموونە: لەکاتی هاتنە خوارەوەی ئایەتی ﴿إنّما الخمرُ والميسر ...فهل أنتم منتهون﴾ دەرکەوت کەوا موسڵمانان دەست بەجێ کاری تێ کردن و بەیەکجارەکی ئارەق خواردنەوەیان بەحەرام زانی.. کەواتە لەکاتی خوێندنەوەی قورئان یان گوێ گرتن. دەبێ موسڵمان هۆشی بەلای خۆیەوە بێ و دڵ بێدار بێت و لەگەڵ ئایەتەکاندا خۆی ببەستێتەوە.

٣- دەستوورەکانی (تجويد) بەکار بێنێ ، ئینجا بە دەنگێکی خۆش و بەتەرتیلەوە دەوری بکاتەوە، بەمەرجێ وەتەری دەنگەکە لە ماتەمینی و ملکەچی و (خشوع)ەوە دەرچووبێ نەک بەزۆر دروستی بکات، هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : (إنّ من أحسن الناس صوتاً بالقرآن الذي إذا سمعتموه يقرأ حسِبتمُوه يخشى الله)رواه إبن ماجة. واتە: چاکترین قورئانخوێنی دەنگ خۆش کەسانێکتانە کاتێ گوێتان لێ دەبێ کە قورئان دەخوێنێ وا هەست بکەن کە لە خوا دەترسێ.

٤- ئەگەر دەورکردنەوەی بووە هۆی تێکدان و شێوانی نوێژی موسڵمانان یا ترسی ریای هەبوو، با دەنگی نزم بکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (الجاهر بالقرآن كالجاهر بالصدقة..)رواه ابو داود والنسائي والترمذي (صحيح الجامع الصغير/رقم الحديث٣١٠٥).

٥- لە سەرەتاوە بە (أعوذ با لله من الشيطان الرجيم) دەست پێ بکات ئینجا (بسم الله الرحمن الرحيم)یش بە دوایا بڵێ، ئەگەر سەرەتای سورەت بوو با بە پچڕ پچڕ نەیخوێنێ چونکە لەگەڵ پیرۆزی قورئانەکەدا ناگونجێ و دەبێ هەوڵ بدات لە شوێنێکی خامۆش و بێ دەنگدا بەگەرمی دەوری بکاتەوە، (يحی)ی کوڕی (معاذ) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئەفەرموێت: (أشتهي من الدنيا شيئين: بيتاً خالياً ومصحفا جيد الخط أقرأ فيه القرآن). واتە: ئارەزوو مەندو سەودای دوو شتم لە دنیادا: ماڵێکی چۆڵ و بێ قرە لەگەڵ قورئانێکی خەت جوان تا تیایدا بخوێنم.

٦- هەر کاتێک ئەو ئایەتانەی تووش هات کە سوجدەی تیا دەبێ ئەوا پاش تەواو بوونی ئایەتەکە سوننەتە سوجدە بەرێ و ئەم دوعایەی تیا بخوێنێ: (أللهمّ لك سجدتُ و بك آمنت ولك أسلمتُ، سجدَ وجهيَ للذي خلقَه وصوَّرَه وشقَّ سمعَه وبصره بحوله وقوّته فتبارك الله أحسن الخالقين)أخرجه أصحاب السنن.

٧- شتێکی شیرین و بایەخدارە کە ئایەتێک یان زیاتر بۆ چەند جارێک دووبارە بکرێتەوە، چونکە مەبەست لە قورئان خوێندن وریا کردنەوەو ڕاپەڕاندنی دڵ و هۆشە.. جا کە ئایەتێک ئەو مەبەستەی هێنایە دی و تەزووە ئیمانییەکە هەموو گیانی گرتەوە هەقی خۆیەتی چەند جارێک ئەو ئایەتانە دووبارە بکرێتەوە؛ وەک دووبارە کردنەوەی ئایەتی ﴿إن تعذّبهم فإنهم عبادك وإن تغفر لهم فإنك أنت العزيز الحكيم﴾المائدة/١١٨. لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ یان ئەسمای کچی ئەبوبەکر

ئایەتی ﴿فمنَّ الله علینا ووقانا عذاب السموم﴾الطور/٢٧. وە سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئایەتی ﴿واتقوا یوماً ترجعون فیه إلی الله﴾ وە هەروەها (ضحاك) (ڕەحمەتی خوای لێبێت) ئایەتی ﴿لهم من فوقهم ظلل من النار ومن تحتهم ظلل ذلك یخوِّف الله به عباده یا عبادِ فاتقون﴾الزمر/١٦. دووبارەیان دەکردەوە تا بەرەبەیان .

هەروەها بیر لە زۆری و سەنگینی فەرمانەکانی پەروەردگاری و کەمتەرخەمی خۆی بکاتەوە.. لە داواو ویستی پەروەردگارو ئارەزواتی پوچی ئادەمیزاد، لە (جدّي) بەرنامەی خواو بێ ئاگایی و سەرکەشی مرۆڤ.. سەرسام بمێنێ لە بێ سنووری سۆزو بەزەیی خوای گەورە کە چۆن خەمخۆری ئەم ئادەمیزادەیەو چارە بۆ کێشەکانی دیاری ئەکات و وەڵامی پرسیارە ماقوڵ و جۆربەجۆرەکانی ئەداتەوە، وەکو ئایەتەکانی ﴿یسألونك عن الأهلة..، عن الیتامی...، ماذا ینفقون..، عن الروح، عن ذي القرنین، عن الجبال، عن الساعة، عن الخمر والمیسر﴾ .. وە هەروەها ئەو ئافرەتە دڵشکاوەی کە سکاڵای دڵی لای پەروەردگاری دەربڕی، کە لە سورەتی (المجادله)دا باس کراوە.

موسڵمان کاتێ پەیڕەوی ئەم ئادابانەی کرد ئەوسا شیرینی ئایەتەکان دەچێژێ و دەبێتە نوورو ڕووناکییەک لە ژیانیداو، توێشوو زادێکی بەکەڵکیش لە ئاسماندا، بۆیە پێغەمبەر ﷺ ڕوو بە (ابو ذر) دەفەرموێ : (علیك بتلاوة القرآن فإنّه نور لك في الأرض وذُخر لك في السماء)رواه ابن ماجة في حدیث طویل. وە بەردەوام بە شەپۆلە ناسک و فێنکەکانی سینەی گوشاد دەبێ و هێمنی و سرەوتی پێ دەبەخشێت، چونکە دەورکردنەوەی ئەم قورئانە بەو شێوەیەی کە باسمان کرد ڕێگایەکی ترە بۆ موسڵمان تا بتوانێ شوێنەوارو جێ دەستی ئەو سۆزە ببینێ کە خواوەند دەیڕژێنێ بەسەریا.. (اسید کوڕی حضیر) یەکێک بووە لەو هاوەڵانە کە توانی بە هۆی خوێندنی سورەتی (البقرە)وە ئەو شوێنەوارە هەست پێ بکاو ببینێ: لە (ابی سعیدی خودری)یەوە ئەویش لە (اسیدی کوڕی حضیر)ەوە ڕیوایەت کراوە (خوا لێیان ڕازی بێت): لە کاتێکدا کە (اسید) شەوێک سورەتی (البقرە)ی دەخوێندو وڵاخەکەی لەلایەوە بەسترابووەوە، لەپڕ کاتێ کە (اسید) لە قورئان خوێندن بێدەنگ دەبوو وڵاخەکەشی لە هەڵبەزینەوە دەکەوت و دەسرەوت، دیسان کە دەستی دەکردەوە بە قورئان خوێندن وڵاخەکەی بازێکی تری دەدا، بۆیە (اسید) بێدەنگ بووەوە وڵاخەکە دیسان بێدەنگ بوو، پاشان (اسید) دەستی بە قورئان خوێندن کردەوە وڵاخەکەش دەستی کردەوە بە هەڵبەزین، خێرا خۆی گەیاندە (یحی)ی کوڕی و لە وڵاخەکەی دوور خستەوە، کە سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە وەک پەڵە هەور ببینێ چراو ڕووناکی زۆری تیابوو، کە کەوتە بەیانی ئەم باسەی بۆ پێغەمبەری خوا گێڕایەوە ، ئەویش فەرمووی: بخوێنە ئەی (بنی حضیر) بخوێنە ئەی (بني حضیر)، (اسید) وتی : ئەی پێغەمبەری خوا (یحی)ی کوڕم لە وڵاخەکەوە نزیک بوو ترسام پێی پیا بنێ و بیشێلێ منیش لێم دوور خستەوە، کە سەرم بۆ ئاسمان بەرز کردەوە هەر وەک پەڵە هەورێک کە ڕووناکی و چرای زۆری تێدا بێت کە دەرچوومە دەرەوەش ئاسمانم وەکو خۆی نەدەبینی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەزانی ئەوە چی بوو؟ ئەویش وتی: نەبەخوا نازانم ! پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە فریشتە بوون لە بەر دەنگە سۆزو خۆشەکەت نزیک بووبوونەوە لێت، خۆ ئەگەر تا بەیانی بتخوێندایە ئەوا خەڵکی هەموو سەیریان دەکردو لێیان نەئەشاردرایەوە..)بخاری گێڕاویەتیەوە.

کەواتە پێویستە موسڵمان گرنگی بدات بە دەور کردنەوەی قورئان و بیکاتە یەکەم ویردی ڕۆژانەی؛ بەگوێرەی تواناو بواری بەردەوام بێت.. گرنگ ئەوەیە ڕازی نەبێت بەبێ دەورکردنەوە ڕۆژی لێ ئاوابێت، ئەگەر لە ئەهلی قورئانیش نە بوو (واتە نەخوێندەوار بوو) با لەکاتی خوێندنەوەی قورئاندا بە دڵ گوێبیستی ئایەتەکان بێت، یاخود چەند سورەتێک لەبەر بکات، هەرکاتێک هەلی بۆ هەڵکەوت بیخوێنێ و هەوڵ بدات بچێتە ڕیزی ئەو ئیماندارانەی کە خوای گەورە سەبارەتیان دەفەرموێ: ﴿إنَّما المؤمنون الذين إذا ذكِر ا لله وجلت قلوبهم وإذا تليت عليهم آياته زادتهم إيماناً..﴾الأنفال/٢. واتە: بەڕاستی ئیمانداران ئەوانەن هەر کاتێ ناوی خوایان لاهێنرا دڵیان دەترسێ و ئەگەر ئایەتەکانی پەروەردگاریان بەسەردا خوێنرایەوە ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات.

لە کۆتاییدا دەڵێین: پێویستە لەسەر موسڵمان دەوری قوئان بکاتەوەو بیکاتە هەوارگەو بەهاری دڵی ، بە هاوڕێ و هاودەمی ژیانی هەڵیبژێرێ و دڵ و دەروون و ماڵ و شوێنی پێ ڕۆشن بکاتەوە.. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (إذا قام صاحب القرآن فقرأه بالليل والنهار ذكره وإذا لم يقم به نسيه)رواه مسلم... وآخر دعونا أن الحمد لله ربّ العالمين.


**سەرچاوەکان :**

(١) قورئانی پیرۆز.

(٢) التبيان في آداب حملة القرآن/النووي.

(٣) رياض الصالحين/النووي.

# کردەوەی چاک

بسم الله الرحمن الرحیم

( والعصر إن الإنسان لفي خسر إلا الذين آمنوا وعملوا الصالحات وتواصوا بالحق وتواصوا بالصبر)
العصر

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەرکاتێک پێش ئەوەی لەیەکتری جیادەبوونەوە ئەم سوورەتەیان بەسەریەکدا دەخوێندو ئنجا خواحافیزیان لەیەکتر دەکرد. پێشەوا شافعی -رەحمەتی خوای لێبێ- فەرموویەتی: ئەگەر خەڵکی بەچاکی و وەک خۆی لەم سوورەتە تێبگەن ئیتر بەسیانە. لە قورئانی پیرۆزدا کە باسی باوەڕ دەکرێت یەکسەر دەبەسترێتەوە بە کرداری چاکەوە، وەکو بەڵگەیەک لەسەری، هەروەها مرۆڤ هەموویان لەزەرەردان مەگەر ئەوانەی بەڵێن و پەیمانی باوەڕەکەیان لەگەڵ کردارە باشەکانیاندا گرێ دەدەن .

بۆ بەرچاوروونی و باشتر تێگەیشتن پێویستە پێناسەی تەواوی کرداری باش بکەین، داخۆ کامەیە؟ مەرج و پێداویستی‌یەکانی چین؟ بەڵگەی بوون یان نەبوونی چی‌یە؟ پووچەڵ بوونەوەی کرداری چاکیش بەچی دەبێت ؟

**کرداری چاک** : هەموو هۆکارێکە مرۆڤ بەهۆیەوە لە خوای گەورە نزیک ببێتەوە، جا نیازێکی دڵ بێت یا کردارێک یا وتەیەک کە خوا پێی رازییە، یا پارێزکاریو خۆدوورگرتن و وازهێنانە لە شتێک کە خوای‌گەورە لێی تووڕەیە.

بۆ زیاتر شارەزابوون و هەڵسەنگاندنی کردارەکان، پێویستە ئاگامان لەم خاڵانەی خوارەوە بێت :

١) باوەڕهێنان دەکەوێتە پێش کردارەوە، واتە کرداربەبێ باوەڕ هیچ نرخێکی نییەو، لە قیامەتدا فریای مرۆڤ ناکەوێت، جارێک لای پێغەمبەر ﷺ باسی (ئیبن جدعان) یان کرد وتیان: ئەو ناندەرێکی چاک بوو، زۆر سەردانی خزم و کەسوکاری دەکرد، تۆ بڵێی سوودێکی پێبگەیەنێت، ئەویش فەرمووی: نەخێر، چونکە ئەو جارێک بەزاری‌دا نەهاتووە بڵێت: خوایە لە رۆژی قیامەتدا لە تاوانەکانم ببورە، واتە عەقیدەی تەواو نەبووە.

هەروەها جارێکی تر پێغەمبەر ﷺ بەکچی (حاتەمی طائی) وت: ئەگەر باوکت موسڵمان بوایە رەحمەت و نزای خێرمان بۆ دەکرد (تهذیب السیرة/٢٥٣).

٢) کرداری باش دوو مەرجی سەرەکی هەیە؛

یەکەم/ تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوای گەورەبێت، واتە: نیازپاکی ببێتە هەوێنی هەموو کارەکانی

دووەم/ بەپێی شەرع بێت و بەوجۆرەبێت کە لەئیسلامدا رەنگی بۆ کێشراوە.

٣) کرداری باش هۆکارێکە بۆ ئەوەی مرۆڤ بچێتە بەهەشتەوە، هەرچەندە مرۆڤ کردەوەکانی ئەگەرچی زۆر چاک و بەرچاوبن بەڵام لە بەرامبەر بەهەشتدا هیچ نین چونکە پێغەمبەر ﷺ جارێک فەرمووی: هیچ کەس بە کردەوەکانی خۆی ناچێتە بەهەشتەوە، وتیان تۆش

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ فەرمووی: بەڵێ منیش ناچمە ناوی، مەگەر خوا رەحمەتی خۆیم بەسەردا برێژێ (ترمذی گێڕاویەتیەوە) . هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: (جزاء بما كانوا يعملون)؛ لێرەدا ئەوە روون دەبێتەوە كە كردەوەكانمان لەبەرامبەر بەهەشتدا هیچ نین، چونكە تەمەنی ئێمە زۆر كورتە -درێژترین تەمەن ناگاتە (١٥٠ ساڵ)- بەڵام بەهەشت بڕانەوەی نییە، ئیتر ماوەیەكی كورت لە چاو نەبڕاوەدا نرخی چەندە؟ بەڵام خوایگەورە بەمیهرەبانیی خۆیەوە لەگەڵ بەهەشتیت دەبەخشێت بە موسڵمانان.

پێشەوا (ابن القیم) لە كتێبی (الجواب الكافي)دا ئاگاداریەكمان بیردەخاتەوەو دەڵێت: هەركەسێ فراوانی رەحمەت و لێخۆشبوونی خوایگەورە وا تێبگات كە ئیتر پێویستی بە كرداری باش نییەو هەرچیەك ئەنجام بدات خوا هەر لێی ناگرێت، ئەوە كەوتۆتە هەڵەیەكی زۆر گەورەوە، پێویستە ئەوەش بزانێت كە خوایگەورە لە قیامەتیشدا سزای زۆر توندو سەختی هەیە. شێخ حەسەنی بەسری فەرموویەتی: ( زۆركەس هەن هیواو ئاواتی لێخۆشبوون ئەوەندە بێئاگایان دەكات، تا بێ تەوبەكردن لە جیهان دەردەچن، رەنگە بڵێن: ئێمە گومانی باشمان بە خوای خۆمان بردووە، بەڵام وا نییە، ئەگەر گومانی باشیان پێ ببردایە، ئەوا كردەوەی باشیان دەكرد).

## كرداری باش پێویستە چونكە :

١) لە دنیاو قیامەتدا سوود بە مرۆڤ دەگەیەنێت؛ كرداری چاك لە دنیادا ئەو كەسە خاوەن رێزو قەدر دەكات، بەری چاكە هەر چاكەیەو چی بچێنی ئەوە دەدوریتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( ماأكرم شاب شيخا لسنه إلا قيض الله له من يكرمه عند سنه) ترمذی گێڕاویەتیەوە، واتە: هەرگەنجێك لەبەر پیری رێز لە پیاوێك بگرێت، لە پیریدا خوایگەورە یەكێكی بۆ رام دەكات رێزی لێبگرێت.

كردای چاك شوێنكار لە باوكەوە بۆ نەوەكانی پاش خۆشی بەجێدەهێڵێت، بۆ نموونە: كاتێك موسا پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ پیاوە چاكەكەدا دەچنە لای دێیەكەوەو دەیانەوێت دیوارە رووخاوەكە چاك بكەنەوە كە هی دوو هەتیو بوو، خوایگەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت: ( و أما الجدار فكان لغلامين يتيمين في المدينة وكان تحته كنز لهما وكان أبوهما صالحا) الكهف/٨٢. واتە: بەڵام دیوارەكە هی دوو بێباوك بوو لە دێیەكەداو لەژێریدا گەنجینەیەك حەشاردرابوو، باوكیشیان پیاوباش بوو.

ئیبن كثیر دەفەرموێت: ئەم ئایەتە ئەوەی تێدایە كە باشیی‌و چاكیی باوك شوێنكاری لەسەر منداڵەكانی هەیە لە دنیاو قیامەتیشدا دەتوانێت شەفاعەتیان بۆ بكات .

كرداری چاك لەگەڵ ئەو كەسەدایە لە قیامەتیشدا، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا مات ابن آدم تبعه ثلاث: أهله وماله وعمله، فيرجع اثنان ويبقى واحد؛ فيرجع أهله وماله، ويبقى عمله) متفق عليه.

كاتێك مرۆڤێك دەمرێت كەس و كارو سامان و كردەوەكانی شوێنی دەكەون، دوانیان دەگەڕێنەوەو تەنها یەكێكیان دەمێنێتەوە، كەس وكارو سامانەكەی دەگەڕێنەوە دواوەو تەنها كردەوەكانی لەگەڵیدا دەڕۆن.

لەیەكێك لە پیاوچاكانیان پرسی: بۆ چاكخوازیت هەڵبژارد، فەرمووی: دۆست و خۆشەویستان دەبینم یا خیانەت لەیەكتر دەكەن یا یەكتر جێدێڵن، ئەگەر وەفاشیان بۆ یەك

هەبوو ناچنە نـاو گـۆڕی یـەکترەوە، فریـای یـەک ناکـەون، منیـش چاکـەکاریم کرۆتـە دۆسـت و خۆشەویستم تا هەرگیز لێی جودا نەبمەوە.

جارێک عەبدوڵای کوڕی عومەر کۆمەڵێکی بینی سێبەریان بۆ گۆڕێک دروست دەکرد، پێی فەرموون: واز لەوە بێنن، کردەوە سێبەری گۆڕە.

٢) کردەوەی باش لە قیامەتدا زۆر پێویستە، چونکـە لێپرسینەوەو دادگـەریی خودایـی زۆر وردو سەختە، خوای گەورەش چەند جوان لە وەسفی ئەو رۆژەدا دەفەرمویت: ( فمن يعمـل مثقال ذرة خيرا يره، ومن يعمل مثقال ذرة شرا يره) الزلزال/٧-٨.

واتە: هەرکەسێک هێندەی تۆزە گەردێک چاکەی کردبێت لە رۆژی قیامـەتدا بەرهەمەکـەی دەبینێتەوە.

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: هیچ کەس نییە لە ئێوە کە خوایگەورە لەقیامـەتدا قسـەی لەگەڵدا نـەکات، وەرگێڕیش لـە نێوانیـاندا نابێـت، کـاتێک سـەیری لای راسـت دەکـات تـەنها کردەوەکـانی دەبینێـت، کـە سـەیری لای چـەپ دەکـات کردەوەکـانی دەبینێـت، کـە سـەیری بەردەمیشی دەکات ئاگرێک دەبینێت بە روویدا دێت، خۆتان لە و ئاگرە بپارێزن ئەگەر بە لەتـە خورمایەکیش بێـت (متفق عليه).

موطرەفی کوڕی عەبدوڵای جەرشی دەگێڕێتەوە: شوێن جەنازەیەک کەوتـم بۆ گۆڕسـتان، کـە گەڕاینەوە، دوو رکات نوێژی کورتـم کردو نەمویست درێژیکەمەوە، پاشـان نووسـتم و لەخـەومدا مردووەکەم بینی پێی وتـم: دوو رکات نوێژت کردو نەتویست درێژی کەیتەوە، ئەگەر منیـش دوو رکاتی لەو جۆرەم بکردایە لەهەموو دنیا باشتر بوو بۆم .

٣) پلەو ئاستی خەڵکی لە قیامەتدا بەپێی کردەوەکانیانە :

(أ) لە رەنگ و روویاندا: یەکەم دەستە کە دەچنە بەهەشتەوە وەک مانگی چواردە دەدرەوشێنەوە، ئەوانەی پاش ئەوانیش دەچنە ناوی وەک ئەستێرەیەکی پرشنگداری ئاسمان دەبن (بوخـاریو موسلیم گێڕاویانەتەوە)

(ب) لە ئاستی رێزگرتن دا: لە جـەنگی (مؤتە)دا ژمـارەی موسـڵمانەکان سێهەزار کـەس بـوون، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون: یەکەم پێشـەوا زەیـدی کـوڕی حاریسـەیە ئەگـەر پێکـرا ئـەوا جەعفەری کوڕی ئەبوتالیب، ئەگەر پێکرا با عەبدوڵلای کوڕی رەواحە پێشەوا بێـت و ئـاڵای موسڵمانان بگرێـتە دەست، بەڵام کە گەیشتە مەیدانی جەنگ بینیان تـەنها رۆمـەکان سـەد هەزار کەسن و گاورە یارمەتیدەرەکانیشیان سەد هەزاری تـرن، شەڕ دەسـتیپێکردو زەیـدو پاشانیش جەعفەر شەهید بوون، کە عـەبدوڵلا ئاڵاکـەی گرتـە دەست دەیزانـی کـە شـەهید دەکرێت، کەمێک دڵەڕاوکێی لا دروست بوو، بەڵام خۆی کۆکردەوەو بەخۆی وت: خـۆ ئەگـەر ئێرەش نەبێت هـەردەبێت بمریـت، ئیـتر ئەمـە شـەهیدییە بـۆ نـاچیت بەپیرییـەوە؟ ( فقه السيرة/غزالي). پاشـان ئـەویش شـەهید بـوو، خـالیدی کـوڕی وەلیـد سـوپاکەی کۆکـردەوەو بەنەخشەکی ورد پاشەکشەی کردو سوپاکەی رزگارکرد.

پێغەمبـەر ﷺ خـەوی پێـوە بینیـن و بـۆ هـاوەڵانی گێڕایـەوە: زەیـدو جەعفـەرو عـەبدوڵا هەرسێکیان لەسەر تەختی ئاڵتون بەرزکرانەوە بۆ بەهەشت ، بەڵام تەختەکەی عەبدوڵا کەمێک لە

هی ئەوان نزمتر بوو، وتم: ئەوە بۆ وایە؟ پێیان وتم: ئەوان بێ دوودڵی چوونە پێشەوە، بەڵام ئەم کەمێک دواکەوت ئەوجا چووە پێشێ.
تێبینی بکەن چەند وردەکاریو حیساب کردن هەیە لە دڵسۆزییو راستگۆیی کردارەکاندا.

## شوێنەواری کرداری باش :

١) رزگاربوون لە تووڕەییو سزای خوا لە قیامەتدا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لِمَ تقولون ما لا تفعلون، كبر مقتا عند الله أن تقولو مالا تفعلون﴾ الصف/٢.
بۆ قسەدەکەن و بەکردار نایسەلمێنن، خوا زۆر توڕەیە لەوەی قسەبکەن و بەکردار نەیکەن.
بەم جۆرە تووڕەیی خوایگەورە لەسەر ئەوەیە کە ووتەو کردارەکان پێچەوانەی یەک بن یا یەکێک دەمی هەبێت و زۆر بڵێت بەڵام کرداری لەگەڵدا نەبێت.
لەیەکێک لە فەرموودەکاندا کە (متفق علیه)یە بەم جۆرە وەسفی کابرایەک دەکات: کابرایەک دەهێنن و فڕێی دەدەنە دۆزەخەوە، ریخۆڵەکانی دێتە دەرەوەو وەکو گوێدرێژی سەرئاوی ئاش دەسوڕێتەوە، دۆزەخییەکان لێی کۆدەبنەوەو پێی دەڵێن: ئەوە تۆ نەبووی فەرمانت پێ دەکردین چاکە بکەین و خۆمان لە خراپە بەدووربگرین، ئەویش دەڵێت: بەڵێ: من فەرمانی چاکەم بەئێوە دەدا بەڵام خۆم نەمدەکرد، قەدەغەی خراپەم لەئێوە دەکرد بەڵام خۆم نەمدەکرد. بۆیە دەڵێ گوێدرێژ چونکە هیچ لەو زانیارییە حاڵی نەبووە کە فێری بووە، هەروەک گوێدرێژێک وایە بارەکەی کتێب بێت، سوڕانەوەکەشی ئەوە دەگەیەنێت کە هەمیشە جیاوازی لە نێوان کردارو رەفتاریدا هەبووە، هاتنەدەرەوەی ریخۆڵەکانی بەو دیمەنە ترسناکە، نیشانەی ئەو خراپەکاریو ئاشووب گێڕییەیە کە لە ناخیدا هەڵی گرتبوو.
٢) پیت و بەرەکەت لەو قسەو وتانەدایە کە کرداریان بەدوادا دێت، دەگێڕنەوە چەند عەبدێک دەچنە خزمەت شێخ حەسەنی بەسری -رەحمەتی خوای لێبێت-و داوای ئەوەی لێدەکەن لە وتاری هەینیدا باسی ئازادکردنی کۆیلە بکات، بەڵکو رزگاریان ببێت، بەڵام پاش تێپەڕبوونی سێ هەفتەو لە چوارەمدا لە وتارەکەیدا باسی کردو هانیدان بۆ ئازادکردنی کۆیلەکان و پلەوپایەی قیامەتی بۆ دەرخستن، بەهۆی ئەم وتارەوە زۆر لە کۆیلەکان رزگاریان بوو، بەخۆشییەوە هاتنەلایو سوپاسی ئەو وتاری هەست بزوێنەیان کردو لێشیان پرسی: هۆی دواخستنی ئەو سێ هەفتەیەی چی بوو؟ ئەویش فەرمووی: لەڕاستیدا لەو کاتەدا خۆم کۆیلەم نەبوو، پارەشم نەبوو، ئەو سێ هەفتەیە چاوەڕێم کرد تا خوایگەورە پارەی پێ بەخشیم، کۆیلەیەکم کڕیو ئازادم کرد، ئەوجا هاتم لەسەر مێمبەر باسی پاداشتی عەبد ئازادکردنم بۆ موسڵمانان کرد، خوایگەورەش بەرەکەتی خستە ناو قسەکانمەوەو ئێوە ئازادبوون.
خوای گەورە چەند جوان وتەی پاک و خاوێن لە تابلۆیەکدا دەخەملێنێو دەفەرموێت: ( الم تر كيف ضرب الله مثلا كلمة طيبة كشجرة طيبة، أصلها ثابت وفرعها في السماء، توتي أكلها كل حين باذن ربها).
واتە: نابینیت کە خوایگەورە چۆن نموونەی وتەی چاک وەک دارێکی باش دەهێنێتەوە، ریشاڵەکەی چەسپاوەو لقەکانی لە ئاسماندان، هەموو کاتێک بەری خۆی دەدات بەفەرمانی پەروەردگاری .

## ئەگەر کردەوەی باش ئەما چی روو دەدات :

ئەگەر مرۆڤێک دەستەوسان بوو لـە پێشکەش کردنـی کـرداری چـاکدا، ئـەوا تـەنها قسـەی لەدەست دێـت و ئەم خەسڵەتانەی تیا دەردەکەوێت:

(أ) فێربوون و شارەزایی لە ئیسلام بۆ ئەوەیە خەڵکی پێی بڵێن زانایە، نەک بـۆ ئـەوەی کـاری پێبکات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێـت: (من طلب علما مما يبتغي به وجها لله تعالى ليصيب به عرضا لم يجد عرق الجنة يوم القيامة) -ئەبوداود و ئیبن ماجە گێڕاویانەتەوە-.

واتە: ئەگەر کەسێک هەوڵ بدات بۆ فـێربوونی زانستێک کـە پێویسـتە لـەرێیخوادا بێـت، بەڵام ئەو بۆ مەسەلەیەکی دنیایی بەکاری دێنێ هەوڵی بۆئەدا، ئەوا لەقیامـەتدا بۆنـی بەهەشـت ناکات.

(ب) حەز لە گفت و گۆی بێسەرەنجام دەکات؛ ئەگەر قسەی بەرامبـەر زاڵ بـوو بەسـەریدا ئـەوا زۆری پێ سەرکەوتن پێی ناخۆش دەبێـت و زویرەبێـت، بەڵام ئەگەر قسەی ئـەم سـەرکەوت زۆر پێی دڵخۆش دەبێـت. ئەو جۆرە کەسـانە تـەنها لـەکاتی (مجادلـە)دا زاسـتەکەی خـۆی دەردەخـات، ئیمـامی شـافیعی -رەحمـەتی خـوای لێ بێـت- دەفەرموێـــت: ســوێند بـە خوایگەورە، گفت و گۆم لەگەڵ هەرکەسێکدا کردبێـت حەزم کـردووە راسـتی لەسـەر زمـانی ئەو بێـت.

(ج) هەر بە شوێن عەیب و ئەنگی خەڵکیدا دەگەرێت وکەم وکورییەکانی خۆی لەبیردەچێتـەوە، بەجۆرێک وایلێ دێـت موو لە چاوی خەڵکیدا دەبینێت، بەڵام قەدی درەختێک لـە چـاوی خۆیدا نابینێت!

(د) هەمیشە ئیش و کاری خەڵکی بەکەم دەزانن و رەخنەیان لێدەگـرن، هـەروەک خـوای گـەورە دەفەرموێـت: ( الذين يلمزون المطوعين من المؤمنين في الصدقات والذين لا يجدون إلا جهدهم فيسخرون منهم، سخر الله منهم ولهم عذاب أليم) التوبة/٧٩. ئەم ئایەتە لەبەر ئەم رووداوە هاتـە خوارەوە: عەبدورەحمانی کوڕی عەوف خوا چوارهەزار درهەمی بەخشی، دووڕووەکان وتیـان: ئەوە بۆ ریـایی وادەکـات. پیـاوێکی ئـەنصاریش دوو مـەن خورمـای دەست کـەوتبوو هاتـە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: دوو مەن خورمـان دەست کەوتووە، یەکێکیان بەقـەرز دەدەم بـە خوای خۆم و ئەوی تریانم بۆ منداڵەکانم دەبەمەوە، دووڕووەکان پێیان وت: باشە تۆ نـازانی کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ پێویستیان بەم مەنە خورمایەی تۆ نییە.

ئەمە سیفەتی دووڕووەکانە، خۆیان هیچیان لەدەست نایەت و گاڵتە بـە کـاری خـەڵکیتر دەکـەن و، بەکـەم و هیچـی دەزانـن، ئەگـەر کـارێک بکـەن تـەنها بۆتێکـدان و پەرتـەوازەکردنی موسڵمانانەو بۆ شێواندنی دەروونی خەڵکـە، رەنگـە لـە دەوروبـەری خۆمـان چـەندەها کەسـی وا ببینین کە هیچ کارێکی چاکەیان لەدەست نایەت و لە خراپەشدا کەس نییە پێشیان بکەوێت.

## ئەو شتانەی کردەوە پوچەڵ دەکەنەوە :

١- منەت کردن بەسەر خوای گەورەدا بەرامبەر ئەو پەرسـتن و کارانـەی ئـەنجام دەدرێت: خوایگەورە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( ولا تمنن تستكثر) واتە: منەت مەکە، کەم پێشـکەش کەیت و بەزۆری بزانیت.

کاتێک خێڵی (ئەسەد) هاتتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتیان: هەموو عەرەب شەڕی لەگەڵدا کردیت ئێمە نەمان کرد ، لەم کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: (يمنون عليك أن أسلموا، قل لا تمنوا علي إسلامكم بل الله يمن عليكم أن هداكم للإيمان إن كنتم صادقين) الحجرات/١٧.

واتە: منەتی ئیسلامەتیت بەسەردا دەکەن تۆش پێیان بڵێ بەهۆی ئیسلامەتیتانەوە منەتم بەسەردا مەکەن، ئێوە منەتباری خودان کە ڕێنموویی کردوون و ئیمانی پێ بەخشیون، ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن) .

٢- منەت کردن بەسەر خەڵکیدا کردەوە پوچەڵدەکاتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ( لا تبطلوا صدقاتكم بالمن والأذى) البقرة/٢٦٤.

واتە: چاکەکانتان بە منەتباریو ئازاردانی خەڵکی بەتاڵ مەکەنەوە، لەفەرموودەیەکیشدا بەم شێوەیە هاتووە: ( لا يدخل الجنة عاق ولا منان، ولا مدمن خمر) ئیبن ماجە گێراویەتیەوە.

واتە: ئەم کەسانە ناچنە بەهەشتەوە، ئازاردەری دڵی دایک و باوک، منەت کەر بەسەر خەڵکیدا ، هەمیشە سەرخۆش.

٣- ریاکردن و هەوڵ دان بۆ پەیداکردنی ناوبانگ و شۆرەت لە کاتێکدا کە خوای گەورە فەرموویەتی: ( من جاء بالحسنة فله عشر أمثالها) هەرکەسێ چاکەیەک بکات دە قات پاداشتی دەدرێتەوە.. ئیتر کێ هەیە بتوانێت پاداشتی بەو شێوەیە ببەخشێت؟

لێرەدا پێویستە تێبینی ئەوە بکرێت، ئەو چاکانەی بە پاکیو پوختی پێشکەش دەکرێ، و مەبەست تیایدا تەنها خوای گەورەیە، ئەوانە دە قات پاداشتیان هەیەو لەقیامەتدا خاوەنەکانیان بەختەوەر دەکەن.

کێ هەیە لە قیامەتدا پێویستی بە کردەوەی چاک نەبێت؟ کێ هەیە نەیەوێت لە دۆزەخی بڵێسەدار ڕزگاری بێت؟ کێ هەیە حەزی لە بەهەشتی پڕ نازونیعمەت نەبێت؟ هەرکەس وایە با کردەوەی پاک و ڕاست پێشکەش بکات.

# حەقیقەتی نوێژ و

# مەرجە مەعنەوییەکانی

**دوو لایەنی دەرەکیی و ناوەرۆکی نوێژ:**

**نوێژ** - وەک هەر پەرستشێکیتر کە مرۆڤی موسڵمان ئەنجامی ئەدات - دوو لایەنی هەیە؛ لایەنێکی کرداریی دەرەکی ، لەگەڵ لایەنێکی ناوەرۆکیی مەعنەوی .. زوربەمان لە ڕێی کتێبە فیقهییەکانەوە ، لە چۆنیەتیی ئەنجامدانی نوێژو مەرجە دەرەکییەکانی ئاشنا بووین و ، کەمتر گرنگیمان داوە بە لایەنە سەرەکییەکەی کە لایەنی ناوەرۆکیی مەرجە مەعنەوییەکانیەتی .. بۆیە بە پشتیوانی خوا لەم کورتە باسەدا تیشکێک دەخەینە سەر ئەو لایەنەی، لە ڕوانگەی قورئانی پیرۆزو فەرموودەکانی پێغەمبەری خواوە (دروودی خوای لەسەر بێ).

**حەقیقەت و ناوەرۆکی نوێژ:**

ئەگەر بە وردی لەئایەت و فەرموودەکان ورد ببینەوە، دڵنیا دەبین کە نوێژ پلەو پایەیەکی گرنگی هەیە و ئەنانەت خوای گەورە کردوویەتیە یەکەم ڕەوشتی پێناسەی موسڵمانی سەرفراز ﴿قد أفلح المؤمنون الذين هم في صلاتهم خاشعون﴾.. بۆیە پێغەمبەری خواش بە کۆڵەکەی ئایین ناساندوویەتی ، وەک لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە دەفەرموێ : (عموده الصلاة) ابوداود گێڕاویەتیەوە .

جا ئەگەر نوێژ ئەوە پلەوپایەو ڕادەی گرنگیی بێت ، دەبێ حەقیقەتی چی بێت و حیکمەت لە واجب کردنی کامە بێت ؟! ئایا دەگونجێ ئەو پلەو پایەو گرنگییە بەجوولە لاشەییەکانی ناو نوێژ بێتە کایە ؟ یان نهێنیی تری هەیەو خۆی لە مەرجە مەعنەوییەکاندا حەشار داوە ؟

بە ورد بوونەوە لەقورئانی پیرۆز - کە نامەی ڕێنمویی خواییە بۆ هەموو پێداویستییەکانی مرۆڤ و سەرچاوەی زانیاریە ئاینییەکانە - دڵنیا دەبین (نوێژ بۆ ئەوە بڕیار دراوە کە مرۆڤی موسڵمان بکەوێتە یادی خوای گەورە).

**بەڵگەی قورئانی**

**بۆ دیاریکردنی حەقیقەتی نوێژو حیکمەتی واجب بوونی :**

بەڵگەی ئەم ڕاستیی زانیارییە سەبارەت بە نوێژو حیکمەت لە واجب کردنی، فەرموودەی خوایە کە دەفەرموێ : ﴿إنني أنا الله لا إله أنا فاعبدني و أقم الصلاة لذكري﴾ ١٤/طه .

خوای پەروەردگار ڕوو دەکاتە موسا پێغەمبەر و فەرمانی پیا دەدات کە بۆ ئەوەی بکەوێتە یادی خوا هەستێ بە ئەنجامدانی نوێژ .. ئەو پیتی لامەی کە لەسەر(لذكري) یە پێی دەگوترێ (لامی تەعلیل) ، واتە پیتێکە تایبەتە بەدیاریکردنی هۆو بەڵگەی ئەو حوکمەی دادەنرێت .

بێ گومان هەموومان دەزانین کە ئامانجی دروستبوونی مرۆڤ پەرستشی خواو ئاوەدانکردنەوەی زەوییە.. دیارە ئەو پەرستشە مافی خۆی نادرێتێ شێوەی تەواوی خۆی وەرناگرێ ، تا کاتێ مرۆڤ نەکەوێتە یادی خوای گەورە. خوای گەورەش کە بەدیهێنەری مرۆڤە

زانیویەتی کە گونجاوترین و تەواوترین ڕێوشوێنی یادکردنەوەی تەنها نوێژە .. واتە ئەگەر ڕوحەوە نوێژ کرا کە هۆکاری نزیکبوونەوە لە خواو یادکردنەوەیەتیو، مەرجەکانیش هێنرانە ئەوە نوێژخوێن دەبێتە (ذاکر) و هەمیشە دڵبێدار دەبێو خوای لە بیر دەبێ.

پێویستی یادکردنەوەی خواش لەوێوە هاتووە ، کە بڕیارە مرۆڤی موسڵمان هەمیشە لە (عبودیتَ)و بەندایەتیی خوادا بێت و ، پەیوەندیی بەخواوە نەپچڕێت .. جا تاکە ڕێگەی ئەوەیە کە داوای یارمەتی لە خوا بکات کە لە ڕێی ئەنجامدانی ئەرکە هەمیشەییەکانی (بەندایەتی)دا پشتی بگرێت و هێزو توانای بداتێ .

دیارە خوای گەورە خۆی باشتر زانیویەتی کە تەواوترین و لەبارترین دیمەن و شێوەی پاڕانەوە لە خوا، دیمەنی نوێژە ! ئەو نوێژەی کە لە قورئاندا مەرجە مەعنەوییەکانی باس کراون و، جبریل شێوەکەشی پیشانی پێغەمبەری خۆشەویست داوە .

لێرەوە ئەوەش دەردەکەوێت کە نوێژ بۆچی بە عەرەبی ناونراوە (الصلاة) کە مانای دوعاو نزاو پاڕانەوە دەدات .. پاڕانەوە لە خوا بۆ یارمەتیدانی موسڵمان تا ئەرکی بەندایەتی باش بەجێ بێنێت . لوتکەی ئەو داواکارییو دۆعایەش لە ئایەتی ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَ إِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾دا دیاری دەدات ، کە لە بەشی یەکەمیدا ئەرکی بەندایەتی ڕادەگەیەنرێو ، لە دووەمیدا داوای یارمەتی دەکرێ ! فەرموودەی پێغەمبەری خواش کە دەفەرموێ: (المُصلّي يُناجي ربّهُ) - واتە : نوێژخوێن لە پەروەردگاری خۆی دەپاڕێتەوە- ئەم ڕاستییە دوویات دەکاتەوە.. (فەرموودەکە بوخاری و موسلیم) گێڕاویانەتەوە.

**مەرجە ناوەڕۆکی و مەعنەوی یەکان:**

پاش ئەوەی لە حەقیقەتی نوێژو حیکمەتی پێویست گێڕانی تێگەیشتین ، دەبێ بزانین کە هەرگیز بە جموجوڵە لاشەیی یەکان و دیمەنەکەی دەرەوەی ئەو حەقیقەت و حیکمەتە بۆ نوێژ دروست نابێت .. بەڵکو چەند مەرجێکی (قەلبی)و مەعنەوی هەن کە دەبێ لەگەڵ مەرجەکانی دەرەوەیدا ڕەچاوکرێن، تا نوێژ بەرهەمەکەی خۆی بدات و، حەقیقەتەکەی بێتە دی .. کە ئەمانەن:

**یەکەم : ئامادەیی دڵ و نەبوونی غەفلەت و بێ ئاگایی:**

ئەمە یەکەم مەرج و گرنگترین مەرجی مەعنەوییە بۆ نوێژ، چونکە ئەو کەسەی نوێژدەکات ئەگەر دڵی بێدار نەبێو سەرحاڵ نەبێ ، نە لە جموجوڵ و هەڵس و کەوتەکانی ناو نوێژ سوود دەبینێ ، نە لە خوێندنی ئایەتەکان و شتەکانی تری ناو نوێژ چێژ دەبات .. بۆیە دەبێ لە کاتی نوێژدا نوێژخوێن ئەوە بزانێ کە لەبەردەم خوای گەورەدا وەستاوەو ، لە ڕێی نوێژەوە گفتوگۆی لەگەڵ دەکاو لێی دەپاڕێتەوەو ، داوای لێدەکات کە یارمەتیی بدات تا لە ئەنجامدانی ئەرکی بەندایەتیو پەرستشدا سەرکەتوو بێت .

بەڵگەی بەپێویست گێڕانی ئەم مەرجە ، ئەمانەن :

١- خوای گەورە لە قۆناغە سەرەتاکانی حەرامکردنی عارەقدا هۆی قەدەغەکردنی خواردنەوەی عارەق لە کاتی نوێژدا ، بەوە دەردەخات کە خواردنەوە مرۆڤ مەست و بێهۆش دەکاو ، سەرەنجام نوێژخوێن تێناگات لەو وشانەی کە دەیانڵێ. ئەوەتا دەفەرموێ : ﴿يأيها الذين آمنوا لا تقربوا الصلاة وأنتم سكارى حتى تعلموا ما تقولون﴾ ٤٣/النساء . واتە : (ئەی ئەوانەی

بڕواتان هێناوە ! لە کاتێکدا کە مەست و سەرخۆشن ، نزیکی نوێژ مەکەون، بۆ ئەوەی تێبگەن کە چی دەڵێن !).. کەواتە هەر شتێک ڕێگربێت لەوەی لە واتاکانی نوێژ تێبگەین دەبێ لابدرێن و ، لە کاتی نوێژدا حاڵەتێکمان هەبێت کە لە واتاکان تێبگەین ، ئەوەش تەنها بەوە دەبێت کە دڵمان ئامادەبێت و هەستمان لەسەرخۆ بێت و ، هەر شتێک زەینمان سەرگەرم بکات لەکاتی نوێژدا لە خۆمانی دوور خەینەوە..

هەر لەبەر ئەمەشە کە چاکتروایە لەم کات و حاڵەتانەدا نوێژ نەکرێت :

کاتی تینوێتی یا برسێتیی زۆر ، کاتی ئازارێکی زۆر ، کاتی پێگیران و حاجەتی دەست بەئاو.. تەنانەت هەندێ لە زانایان وایان پێ چاکە لەکاتی هەواڵی زۆر خۆش یان ناخۆش، یا گەیشتنی میوانێکی تاسۆق ، یا هەر شتێکی تری لەم بابەتە -کە زیهن مەشغوڵ دەبێ- نوێژنەکرێ و ، ئەگەر بواری کاتەکەی مابوو دوابخرێت بۆ کاتێکی ئاسایی ، کە نوێژ خوێنەکە بتوانێ دڵی ئامادەو حەواسی لەسەر خۆی بێت .

٢- هەر لەسەر هەمان مەبەستە کە خوای گەورە هەڕەشە دەکات لەو کەسانەی کە دەرهەق بە نوێژەکانیان فەرامۆشکارن و دەفەرموێ : ﴿فویل للمصلّین الذین هم عن صلاتهم ساهون﴾ ٤/الماعون .. واتە : واوەیلاو سزا بۆ ئەو نوێژکەرانەی سەبارەت بە نوێژەکانیان فەرامۆشکارن ، دیارە لەبەر ئەوەیە کە گوێ بە ماناو ناوەرۆکی نوێژەکانیان نادەن .

٣- خوای گەورە سەبارەت بە نوێژی بێبڕواکان دەفەرموێ : ﴿وماکان صلاتهم عند البیت إلاّ مکاء و تصدیة﴾٣٥/الأنفال.. واتە نوێژی ئەوان (بێبڕواکان) جگە لە فیکەفیک و چەپڵەلێدان شتێکیتر نیە، بێگومان بێبڕواکان شتێکیان دەکرد ناویان لێنابوو (نوێژ) ، بەو شێوەیە کە قورئان باسی دەکا، فیکەیان لێ دەداو بە چەپڵە دەسوڕانەوە بە دەوری کەعبەدا.. جا خوای گەورە موسڵمانان فێر دەکات کە نوێژی ئەو بێ بڕوایانە هیچ بایەخێکی نیە ، چونکە فیک وهوڕ زیاتر هیچ نیە، بێناوەرۆکەو دڵ و دەروونی لەگەڵدا نیە .. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە جموجوڵی بێگیان سودی نیەو حیکمەتی نوێژ ناهێنێتە جێ .

## دووەم : نوێژکردن بە چالاکی و ، دووری لە تەمەڵی و سستی:

لە دوو جێگەی قورئانی پیرۆزدا ئاماژە کراوە کە تەمەڵی لە نوێژداو سستی کردن لەبەدەمەوەچوونیدا -خوا پەنابات- لە سیفەتی دووڕووەکانە .. ئەو ئاماژەکردنانەش بۆ بێدارکردنەوەی موسڵمانانە کە دووربن لەو خەسڵەتە ناپەسەندەو ، بە چالاکیو زەوقەوە بچنە دیداری خوای گەورە .

ئەو دوو جێیەش ئەمانەن :

١- لە زنجیرەی دیاریکردنی ڕەوشتە بەدەکانی دووڕووەکاندا دەفەرموێ :

﴿وَإذا قامُوا إلی الصَّلاة قامُوا کُسالی یُراؤُون النّاس و لایَذکُرون ا لله إلاّ قلیلاً﴾ ١٤٣/النساء.. واتە : هەرکات (دووڕووەکان) هەڵدەستن بۆ نوێژ بەشێوەیەکی تەمەڵیی هەڵدەستن ، ڕووپامایی و ڕیابازیی دەکەن و زۆر کەم نەبێ ناوی خوا نابەن .

٢- لە شوێنێکی تردا خوایگەورە دیاریدەکات کە یەکێ لە هۆی وەرنەگیرانی خێرو خێراتی دووڕووەکان ئەوەیە کە بە تەمەڵی نوێژ دەکەن . دەفەرموێ: ﴿وما منعهم أن تُقبَل منهم نفقاتهم إلاّ

انهم كفروا بالله و برسوله و لا يأتون الصّلاة إلاّ وهم كسالى ولا ينفقون إلاّ وهم كارهون﴾ ٥٤/التوبة ..
واته : هيچ شتێ رێی نەگرت لە وەرگیرانی خێراتەکانیان ؛ ئەوەنەبێ کە دەرهەق بە خواو پێغەمبەرەکەی بێبڕواییان نواندو ، بە تەمەڵیش نەبێ ناچن بەدەم نوێژەوەو ، بە نابەدڵیش نەبێ لە ماڵ و سامانیان نابەخشن .

ئەم دوو ئایەتە دەری دەخەن کە ( تەمەڵی لە نوێژکردندا ) لە ڕەوشتی ناپەسەندی دووڕووەکانەو ، دەبێ موسڵمانان لێی بەدووربن و ، بە چالاکی و زەوقەوە پێشوازیی لە نوێژەکانیان بکەن و ، ئەوەیان لەبیر نەچێ کە نوێژکردن ڕاوەستانە لەگەڵ خوای گەورەو ، وتووێژ لەگەڵ کردنیەتی و ، زۆر ناشایستەشە کە لەبەردەم خواو لەگەڵ خوادا مرۆڤ تەمەڵ و بێ هەست بێت .

## سێیەم : ملکەچی ( خشوع ) لە نوێژدا :

موسڵمان لە کاتی نوێژکردندا پێویستە ئەوەی لەبیربێت کە لە حاڵەتێکی ئاساییدا نیەو ، لەبەردەم خوای گەورەدا وەستاوەو ، لەگەڵ دوپاتکردنەوەی دروشمی بەندایەتیدا وتووێژی لەگەڵ دەکات و ، داوای یارمەتیی لێدەکات و ، جگە لەوە کە جۆرەها (حمد) و (تسبیح) و (ذکر) لە نوێژەکەیدا هەیە.. قورئان دەخوێنێت و ، باسی دوا ڕۆژو ڕووداوەکانیو ، ئەرکی (عبودیت)و پێداویستیەکانی ، وەبیرخۆی دێنێتەوە .. بۆیە زۆر پێویستە لە کاتی نوێژەکانیدا ملکەچ و (خاشع) بێت .

جێگەی (خشوع) لەسەرەتادا دڵە ، واتە نوێژخوێن لەدڵی خۆیدا ئەو هەستەی بۆ دروست دەبێ کە لەسەرەوە وتمان .. پاشان ئاسەواری ئەو کارەی دڵ لە ئەندامەکاندا دەردەکەون و ، ملکەچیو کزی و دیمەنی بەندایەتیی بۆ خوا لە دەرەوەی ئەو کەسەدا بەدەر دەکەوێت ..

بەڵگەی قورئانی بۆ گرنگیی ئەم مەرجە ئەمانەن :

١- خوای گەورە دەفەرموێ :﴿واستعينوا بالصبر و الصّلاة و إنها لكبيرة إلاّ على الخاشعينَ الّذينَ يظُنّونَ أنّهم مُلاقوا رَبِّهم و أنّهم إليهِ راجعون﴾ ٤٥-٤٦/ البقرة.. واتە : پشت ببەستن بە ئارامگری و نوێژ، نوێژ زۆر زەحمەتە مەگەر لەسەر ئەوانەی ملکەچن ، ئەوانەی کە هیوای گەیشتن بە پەروەردگاریان هەیەو ، دڵنیان کە بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە .

ئەم ئایەتە پیرۆزە دەری دەخات کە هیوای گەیشتن بە خواو گەڕانەوە بۆ لای هاندەرێکی باشن بۆ ئەوەی (خشوع)و ملکەچیی دروست ببێ .. جگە لەوە ئایەتەکە ئەوەش دەردەخا کە بە ملکەچی و(خشوع) گرانیی نوێژ ئاسان و سووک دەبێت و هەرکەس ملکەچیی نەبێت نوێژ لەسەری گران و زەحمەتەو، سەرەنجام تام وچێژیشی لێنابات و ، بە تەمەڵی و سستی دەیکات .

٢- لە ئایەتێکی تردا خوایگەورە (خشوع)و ملکەچی لە نوێژدا دەکاتە یەکەم نیشانەی سەرفرازی ئەهلی ئیمان و دەفەرموێ : ﴿قد أفلحَ المؤمنون الذين هم في صلاتهم خاشعون﴾ المؤمنون/١.. واتە : بەڕاستی بڕواداران سەرفرازن ، ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا مل کەچن .. هەر ئەم ئایەتەش وای کردووە کە پێشەوا (قرطبی) ڕای ئەو زانایانە پەسەند بکات کە (خشوع)یان کردووە بە یەکێ لە فەرزەکانی نوێژ، نەک سوننەتێکی زیادە لە پێویست ، وەک لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا گوتوویەتی .

تێبینی :

(خشوع) و ملکەچی وەک وتمان لە سەرەتاوە کاری دڵەو مرۆڤ نابێ بەزۆر ڕواڵەتی ملکەچیی دەربخا ، چونکە ئەگەر دڵ ئەو حاڵەتەی بەخۆوە دی کە خاوەنی لەبەردەم خوادایە ، ئەو خوایەی کە خاوەنی گەردوونەو بۆ لای ئەویش دەگەڕێتەوە ؛ ئیتر بە شێوەیەکی ئاسایی‌و بەبێ زۆر لە خۆکردن ئەندامەکانی تر ملکەچی‌یان پێوە دەردەکەوێ .

هەر لەبەر ئەو تێگەیشتنەشە کە پێشەوا عومەری کوڕی خطاب کاتێ لاوێکی بینی کە لە نوێژدا سەری کز کردبوو ، فەرمووی فلانەکەس ! سەر بەرزبکەرەوە ..(خشوع)و ملکەچی ئەوەیە کە لە دڵدایە.

## چوارەم : ئارامگرتن لەسەر مەرجە گرنگەکانی نوێژ :

لەبەرئەوە کە (خشوع)و ملکەچی‌و دڵبێداریی‌و سەرحاڵی، عەزیمەو ئازایەتیی دەوێ‌و ، دیاریشە کە نوێژ گەورەو گرانە لەسەر ئەو کەسانەی کە تەمەڵن و ، تەنها لەسەر ملکەچەکان ئاسانە .. وەک خوا دەفەرموێ: ﴿و إنّها لكبيرة إلاّ على الخاشعين﴾ . لەبەرئەوە خوای گەورە فەرمانی داوە کە هەرکەس دەبێ فەرمانی نوێژکردن بە کەسوکاری بدات و ، خۆیشی خۆڕاگرو ئارام بێت دەرهەق بە نوێژەکانی .. دەفەرموێت: ﴿وامر أهلَك بالصّلاةِ واصطَبِر عَليها ﴾ ١٣٢/طه واتە : فەرمان بدە بە خێزان و کەسەکانت بۆنوێژ کردن و ، خۆیشت هەوڵ بدە کە زۆر خۆڕاگر بی لەسەری.

وشەی (إصطبر) کە فیعلی فەرمانە و لەبابی (افتعال)ە ، مانای زۆر لەخۆکردن و گرنگیدانی زیاد دەگەیەنێ ، واتە ئەگەر (صبر) بە مانای خۆڕاگرتنە، (إصطبر) بەمانای زۆر لەخۆکردن و زیادە گرنگیدانە بە صەبرو خۆڕاگری.

## پێنجەم : بەردەوامیی لەسەر نوێژکردن :

ئەو مەرج وحاڵەتانەی پێشتر باس کران دەبێ ببنە ڕەوشتی هەمیشەیی موسڵمانی نوێژ خۆێن و ، هەمیشە ئاگای لێیان بێ‌و ، بەردەوام بێ‌لەسەر نوێژەکانی بەو شێوەو مەرجانەی کە باس کران .

جا هەرکەس ئەو وەسفەی تێدا بوو، واتە بەردەوام بوو لەسەر نوێژەکانی ـ بە مەرجەکانیەوە ـ ئەوە ڕەوشتێکی گەورەو بەبایەخی بۆ دروست دەبێ ؛ ئەویش بریتی‌یە لە نەمانی هەڵپەبردن و هەڵشەیی کە قورئان بە (هَلَع) ناوی بردووە، هەر خۆیشی مانای (هَلَع) بەوە دەکات کە مرۆڤ بە تووشهاتی ناخۆش بێ‌ئارام ببێ‌و لە پێشهاتی چاکیش ڕێگر بێت .. ئەوەش حاڵی هەموو مرۆڤێکە؛ جگە لە کەسانی نوێژکەرو ڕوو لە خوا. ئەوەتا دەفەرموێ: ﴿ إنّ الإنسان خلق هلوعا.إذا مسّهُ الشّرُّ جزوعاً وإذا مسّه الخيرُ منوعاً.الاّ المصلّين الّذينَ هُم على صلاتهم دائمونَ﴾ المعارج ١٩-٢٢.

واتە: بە دڵنیایی مرۆڤ وا دروست کراوە کە بە هەڵپە و (هَلوع) بێت، کاتێ ناخۆشی‌یەک تووشی هات بێتاقەتیی دەردەخات و، کە خۆشیش هاتە پێشی خۆی لێ لادەدات، ئەمە حاڵی هەموو مرۆڤێکە جگە لەو نوێژخوێنانەی کە لەسەر نوێژەکانیان بەردەوامن .. (قرطبی) لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەفەرموێ : (بەردەوامیی لەسەر نوێژ بەوە دەبێ کە باش بەجێ بهێنرێ و

. هیچ شتێک نەبێتە هۆی گوێ پێنەدانی) .

## شەشەم : پارێزگاریی لە نوێژەکان :

ئەمەش لە قورئانی پیرۆزدا بە شێوەی فەرمان لە لایەن خواوە هاتووە ..

١- لە ئایەتی (٢٣٨/البقرة) دا دەفەرموێ : ﴿حافظوا علی الصّلوات و الصلاة الوْسطی وقوموا لله قانتينَ﴾ واتە : پارێزگاریی بکەن لەسەر نوێژەکان و نوێژی ناوەنجی و، بە ملکەچیو نیازمەندییەوە لەبەردەم خوادا بۆ خوا بوەستن .

٢- لە ئایەتی (٩٢/ الأنعام) دا دەفەرموێ: ﴿والذين يؤمنون بالآخرة يؤمنون بهِ و هم علی صلاتِهم يحافظون﴾ واتە : ئەوانەی کە بە ڕۆژی دوایی بڕوایان هەیە ئەوانەن کە بڕوایان بە قورئان هەیەو، لەسەر نوێژەکانیشیان پارێزگاریی دەکەن.

٣- لە سورەی (المؤمنون) یشدا و لە ڕیزی ڕەوشت و لە ڕیزی ڕەوشت و خووی بڕواداراندا بە دەرخستنی ملکەچی لە نوێژدا دەست پێ دەکاو بە پارێزگاریی لە نوێژەکان کۆتایی دێنێ . دەفەرموێ: ﴿والذين هم علی صَلَواتهم يُحافظون﴾ ٩/المؤمنون.. واتە ئەمە بە ڕەوشتێکی هەمیشەیی ڕیزی ڕەوشتە پەسەندەکانی بڕواداران دانراوە .

٤- لە سورەتی (معارج) یشدا بە هەمان شێوە دەفەرموێ : ﴿الذين هم علی صلاتهم يحافظون﴾ ٣٤/ المعارج .. لەم سورەتەشدا بە مەرجی بەردەوامی (مداومە) لەسەر نوێژدەست پێ دەکات و، بەم وەسفی (محافظة) یە کۆتایی بە ڕەوشتەکانی نوێژکەر دێنێت . مانای (محافظة) و پارێزگاریی نوێژیش ئەوەیە کە هەموو مەرجەکانی ڕەچاو بکرێن و پشت گوێ نەخرێن ، چ مەرجە ڕواڵەتییەکان ، چ مەعنەوییەکان .

(قرطبي) دەفەرموێ :(پارێزگاریی لەسەر نوێژ واتە : دەستنوێژی تەواوی بۆ بگیرێو، ڕەچاوی کاتەکانی بکرێو مەرج و خواستەکانی و سوننەت و شێوەکانی گرنگییان پێ بدرێو، بە نزیکبوونەوە لە گوناه و تاوان خێریان لە دەست نەدرێ . کەواتە مەرجی بەردەوامیی (مداومة) بۆ خودی نوێژەکانە (مەرجی ناونوێژ) ؛ بەڵام مەرجی پارێزگاریی (محافظة) بۆ حاڵەت و پێداویستییەکانی دەوروبەری نوێژە!).

## (نوێژکردن) یا (ڕاگرتنی ئەرکی نوێژ)؟!

زۆرجار جیاوازی لە نێوان (نوێژکردن - أداء الصلاة) و(ڕاگرتنی نوێژ - إقامة الصلاة) ناکرێ.. لە کاتێکدا کە زۆر فەرقیان هەیە و، لە هەموو قورئاندا بە وشەی (أداء) فەرمان نەدراوە بە نوێژکردن و، هەمیشە بە وشەی (إقامة) فەرمانەکان بۆ نوێژ گەیەنراون .. وشەی (إقامة) ش وشەیەکی بابی (إفعال)ەو لە عەرەبیدا بە مانای ڕاگیرکردن دێت و، هەمیشە بۆ ئەرکی گران و قورس بەکار دێت . کەواتە خوای گەورە کە فەرمان دەدات و دەفەرموێ (أقيموا الصلاة) یەکسەر دەبێ بزانین کە فەرمانەکە گرانەو جێبەجێ کردنی پێداویستیی زۆری هەن و، غەیری بەجێهێنانێکی سەرپێیی و ئاسانە .

ئەو ڕاگرتن و (إقامة) یەش کە خوای گەورە داوای کردووەو دەیەوێ بە بەجێهێنانی ئەو مەرجانە دەبێ کە خۆی داوای کردوون .. واتە هەرکەس ئەو مەرجانە بەجێ بهێنێ تەنها ئەوە ڕاگیرکەری نوێژ (مقيم الصلاة) و بە کەسێکیتر ناوترێ کە هەندێ جموجووڵی دەرەکی دەکات و،

وەک پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت : وەک کەڵەشێر سوجدەو ڕکوعەکانی دەبات و ئاگای لە ماناو ناوەرۆک و مەرجەکانی نوێژ نی یە.

**بەرهەم و ئاسەوارەکانی نوێژی ڕاستەقینە:**

نوێژ ئەگەر بەو شێوەیە بکرێ کە خوای گەورە دەیەوێ ، لەقورئانی پیرۆزدا دیاری کردووە.. واتە ئەگەر (إقامە) بکرێ ، بەرچاو کردنی ئەم مەرج و حاڵەتانە مافی خۆی بدرێتێ:

(١) دڵ لەکاتی کردنیدا سەرحاڵ و بێدار بێت (حضور القلب).

(٢) بە چالاکی و زەوقەوە بکرێت (إتيانها بنشاط و البعد عن الكسل).

(٣) (خشوع) و ملکەچی لەگەڵ بێت

(٤) گوێ بە نارەحەتیی دەروون لە کردنیدا نەدرێت و خۆڕاگریی زۆری لەگەڵ بێت (الإصطبار عليها)

(٥) بەردەوامیی لەگەڵ بێت (المداومة عليها).

(٦) سەرئەنجام هەموو ئەو مەرجانە و مەرج و داخوازییەکانی تری بپارێزێت (المحافظة عليها).

ئەرکی نوێژ ئەگەر بەو شێوەیە و بەو مەرجانەوە ئەنجام بدرێت ، ئەوە لای خوا ١٠٠٪ وەرگیراوەو ، بەرهەم و ئاسەوارە لەبەرچاوەکانی دەبێت ، کە خوای گەورە خۆی جەختی لەسەر دەکات و موسڵمانانی لێ دڵنیادەکاتەوە.. ئەوەش بریتییە لە (دوورکەوتنەوەی یەکجاریی لەهەرچی شتی ناپەسەندو نارەوایە).. خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وأقم الصَلاة إنّ الصلاةَ تنهى عن الفَحشاء والمُنكَر﴾٤٥/ العنكبوت. واتە : هەستە بەئەرکی ڕاگرتنی نوێژ، بەڕاستی نوێژ - ئەو نوێژەی کە قورئان پێناسەی کردووەو مەرجی بۆ داناوە - مرۆڤ قەدەغە دەکات و دووری دەخاتەوە لەهەرچی نارەواییو شتی ناپەسەند هەیە

پێشەوا (قرطبی) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ :

(بۆیە دەبێ نوێژ مرۆڤ لەخراپەو بەدکاری دوورخاتەوە چونکە نوێژ قورئان خوێندنی تێدایە کە ئامۆژگاریی مرۆڤ دەکات ، جگە لەوە نوێژ هەموو گیانی نوێژخوێن سەرگەرم دەکات .. کاتێ دەچێتە میحرابی نوێژو ملکەچ دەکات و بیر دەکاتەوە کە لەبەردەم خوادایەو خوای گەورە ئاگای لێیەتی، بەم حاڵەتە دەروونی ڕاست دەبێتەوە و تەسلیم دەبێت و ، لەئەندامەکانیدا ئاسەواری چاودێریی خوا بەسەریەوە دەردەکەوێ ، بەو شێوەیە نوێژخوێن تانوێژێکی تر ئەو حاڵەتە بەسەریدا زاڵە .. بەتایبەتی ئەگەر ئەو خەیاڵەش بکات کە لەهەر نوێژێکدا وادابنێت کە دوایەمین نوێژیەتیو تەمەنی کۆتایی هاتووە .. بۆ وانەبێت ؟ مەگەر موسڵمان دڵنیا نییە کە مردن کات و کەس و نەخۆشی ناناسێ ؟! جا نوێژی ئاوا -بە دڵنیایی- مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە خراپەو بەدکاری و هەموو ناپەسەندییەک.. بەڵام هەرکەس نوێژەکەی هەر لەدەورویەری ئەندام و دیمەنی دەرەوەدا بوو ، ملکەچیی خواو یادکردنەوەی تێدا نەبوو ـ وەک نوێژەکانی ئێمە- (قسەی پێشەوا قرطبی یە!) ئەو نوێژە خاوەنەکەی بەرەو پێش نابات و ، لەجێی خۆی دەیهێڵێتەوە، جا ئەگەر ئەو نوێژکەرە لەسەر ڕێگەی گوناە کردن و نافەرمانیی خوا بوو ، ئەوە نوێژەکەی دادی ناداو ، بەرەلای دەکات کە لەو نافەرمانییەدا ڕۆ بچێت!).

## خوشك و برای رووله خوا ؛

ئەمە کورتە باسێک بوو دەربارەی ئەو نوێژەی کە خوای گەورە لە قورئاندا وەسفی کردوە و ، داوای کردوە .. ئەگەر بەو چۆنیەتییە ئەنجامی بدەی ، بەرهەمی شیرین و ئاسەواری بە پێزی دەبێت ، جگە لەوە کە نوێژ دەبێتە ساتی چوونە حزووری خوای گەورە و موناجاتکردنی و لات ئاسان و بەپێز دەبێت. هەوڵ بدە بەپێی توانا لەگەڵ مەرجە فیقهیەکاندا کۆیان بکەیتەوەو نوێژێکی تەواویان لێ دروست بکەیت.

دەزانم کە لەسەرەتاوە لە لات زەحمەتە .. قورئان خۆیشی ئەوەی فەرمووە، بەڵام هەر ماوەیەکەو دواجار دەبێتە خەسڵەت و خووی هەمیشەت و، هێندە بەرهەمی شیرینی لێ دەبینی کە بۆت ئاسان دەبێو دەروونت پێی گەش و پاراو دەبێت ، ئەوەش بزانە ئەنجامدانی هەر ئەرکێکی شەرعی بەپێی توانایە ، گرنگ ئەوەیە تۆ هەوڵ بدەیت و هەنگاو بنێیت ، ئەوەی لەتوانا بەدەر بێت خوا داوای ناکات

خوای گەورە یارمەتی ئێمەش و ئێوەش بدات کە لەکاروانی بەندایەتی خوادا ڕێبوارێکی بە تفاق بین و ، بە توشەی نوێژ و بەرەکەتی نوێژ ، وزەو توانای هەستان بەو ئەرکەمان پێ ببەخشێ.


**سەرچاوە :**

قورئانی پیرۆز، ئایەتەکانی :

١) ٤٣ / النساء
٢) سورە تی الماعون
٣) ٣٥ / الانفال
٤) ١٤٣ / النساء
٥) ٥٤ / التوبة
٦) ٤٥ / البقرة
٧) ١ و ٩ / المؤمنون
٨) ١٣٢ / طه
٩) ٢٢ و ٣٤ /المعارج
١٠) ٢٣٨ / البقرة
١١) ٩٢ / الأنعام
١٢) ٤٥ / العنكبوت .

# ڕۆژوو

## پاداشت و حیکمەتەکانی

### پێشەکی

لەزمانی عەرەبیدا ڕۆژوو واتە (صوم) بە مانای خۆگرتنەوە هاتووە. لەشەرعدا واتە خۆگرتنەوەو وازهێنانە لە خواردن و خواردنەوەو ئارەزووواتی جینسی هەر لە بانگی بەیانیەوە تا ڕۆژئاوابوون بەمەبەستی گوێڕایەڵی لە فەرمانەکانی خواو نزیک بوونەوە لێی .

خوایگەورە لە سوورەتی (البقرە)دا دەفەرموێت : (فالآن باشروهنّ وابتغوا ما كتب الله لكم وكُلوا واشربوا حتى يتبين لكم الخيط الأبيض من الخيط الأسود من الفجر ثم أتموا الصيام إلى الليل).

خوای گەورە بایەخ و گرنگی تایبەتی بەم عیبادەتە داوەو خستویەتیە ریزی پایە سەرەکیەکانی ئیسلامەوەو چاکترین جۆری ڕۆژووە لەناو هەموو ئایینەکانی ترەوە.

### خێرو پاداشتی ڕۆژوو ( فضائل الصوم ) :

ڕۆژوو خێرو بەرەکەت و پاداشتی گەورەی هەیە لای خوای گەورەو لە ریزی هەندێک کردەوەی چاکی تردا قورئان باسی دەکات و دەفەرموێت : ﴿..والصائمين والصائمات .. أعد الله لهم مغفرة وأجرا عظيما﴾ الأحزاب/٣٥. واتە: ڕۆژووەوانان لە پیاوان و ئافرەتان پەروەردگار لێخۆشبوون و پاداشتی زۆر گەورەی بۆ ئامادەکردوون .

پاداشتی ڕۆژوو لای خوای گەورە بێئەندازەیە، خوای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا فەرموویەتی: (كل عمل ابن آدم يضاعف الحسنة بعشر أمثالها إلى سبعمائة ضعف إلا الصوم فإنه لي وأنا أجزي به ، يدع شهوته وطعامه من أجلي ... ) رواه مسلم . واتە: هەر کردەوەیەکی چاکی ئادەمیزاد چەند قات پاداشتی لەسەر دەدرێتەوە، لە دەقاتەوە بگرە هەتا حەوت سەد قات، تەنها ڕۆژوو نەبێت، ڕۆژوو بۆ منەو خۆیشم پاداشتی لەسەر دەدەمەوە، چونکە لەبەر من واز لە ئارەزوات و خواردن وخواردنەوە دێنێت

هەروەها بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای خوا خۆشترە لە بۆنی میسک، وەک لە کۆتاییئەو فەرموودە قودسیەی پێشوودا دەفەرموێت: (.. ولخلوف فيه أطيب عند الله من ريح المسك ) رواه مسلم .

پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەربارەی خێرو پاداشتی ڕۆژوو دەفەرموێت : ( مامن عبد يصوم يوما في سبيل الله إلا باعد الله بذلك اليوم وجهه من النار سبعين خريفا ) متفق عليه . واتە: هەرکەسێک لەبەر خوا ڕۆژێک بەرۆژوو بێت، ئەوە خوای گەورە بەو ڕۆژە حەفتا پایز رووخساری دوور دەخاتەوە لە ئاگر

لە ڕۆژی قیامەتدا ڕۆژووەوانان ڕێز پلەو پایەی تایبەتیان هەیەو یەکێک لە دەرگاکانی بەهەشت تایبەت کراوە بۆ ئەوان وەک پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ( إن في الجنة بابا يقال له:

الريان، يدخل منه الصائمون يوم القيامة، يقال أين الصائمون؟ فيقومون، لايدخل منه أحد غيرهم، فإذا دخلوا أغلق فلم يدخل منه أحد) متفق عليه ، واته: بەهەشت دەرگایەکی هەیە پێی دەوترێ (ریان) واتە: تێرناو ، لە رۆژی دواییدا رۆژووەوانان لێیەوە دەچنە ژوورەوە کەس ناچێتە ژوورەوە جگە لەوان، کە چوونە ژوورەوە نیتر دادەخرێو کەس لەو دەرگایەوە ناچێتە ژوورەوە

جگە لەو خێرو پاداشتانەی سەرەوە ، رۆژوو گرتن لە مانگی رەمەزاندا زۆر خێرو پاداشتی گەورەترە، چونکە مانگی رەمەزان بۆ خۆی مانگێکی پیرۆزەو قورئانی تیا هاتووەتە خوارەوە ﴿شهر رمضان الذي أنزل فيه القرآن﴾ البقرة/١٨٥

هەروەها شەوێکی تێدایە چاکترو خێرترە لە هەزار مانگ وەک دەفەرموێت: ﴿ إنا أنزلناه في ليلة القدر وما أدراك ما ليلة القدر.. ليلة القدر خير من ألف شهر ﴾ .

پێغەمبەر ﷺ دەربارەی خێرو پاداشت و گەورەیی رۆژووی رەمەزان دەفەرموێت: (من صام رمضان إيمانا وإحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه) متفق عليه. واتە: هەرکەسێک بەئیمان ودڵسۆزییەوە بۆ خوایگەورە مانگی رەمەزان بەرۆژوو بێت، ئەوە خوای گەورە لە گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێت .

بۆیە پێویستە موسڵمانان لە رەمەزاندا زۆر لە جاران زیاتر خۆیان بە خواپەرستیوپاڕانەوەو یادی خواو قورئان خوێندن و داوای لێخۆشبوون و ، خێرو چاکەکردنەوە خەریک دەکەن، بەئومێدی دەستخستنی ئەو هەموو پاداشتانەی کە خوایگەورە بۆی دیاری کردوون .

یەکێکی تر لە قەدرو رێزی رۆژووەوان ئەوەیە کە ئومێد زۆرە دوعاو پاڕانەوەکانی وەربگیرێو جوابیان بدرێتەوە بەتایبەت لەکاتی بەربانگ دا ئەوەتا خوایگەورە لە نێوان دوو ئایەتدا کە هەردووکیان باسی رۆژوو و مانگی رەمەزان دەکەن ئەم ئایەتەی داناوە کە دەفەرموێت: (وإذا سالك عبادي عني فإني قريب أجيب دعوة الداع إذا دعان ) البقرة / ١٨٦. واتە: ئەگەر لێیان پرسیت سەبارەت بە من، ئەوە من نزیکم، هەرکەسێک لەمن بپاڕێتەوە، وەڵامی دەدەمەوەو داواکانی جێبەجێ دەکەم .

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت : ( إن للصائم عند فطره دعوة لاترد) رواه إبن ماجة ، واتە: بێگومان رۆژووەوان لە کاتی رۆژوو شکاندندا ، پاڕانەوەیەکی بۆ هەیە کە نادرێتەوە بە روویدا.

**مەرجەکانی پاداشتی رۆژوو :**

بۆ ئەوەی رۆژووەوان بێبەهرە نەبێت لە خێرو پاداشتی قیامەت پێویستە رەچاویئەم دوو خاڵەی لای خوارەوە بکات :

**ا- خۆ پاراستن لە گوناح و تاوان ،**

رۆژووەوان پێویستە خۆی برازێنێتەوە بە رەوشتە بەرزەکانی ئیسلام و هەوڵ بدات خۆی بە دوور بگرێت لەهەموو جۆرە تاوان و خراپەیەک ، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( إذا كان يوم صوم أحدكم ، فلا يرفث ولا يصخب فإن سابه أحد أو قاتله فليقل: إني صائم ) متفق عليه. واتە: ئەگەر یەکێکتان بەرۆژوو بوو با نەچێتە لای خێزانیو توورەنەبێت و بۆڵەو قۆڵە بەسەر کەسدا نەکات، وە ئەگەر یەکێک جنێوی پێدا یا شەڕی پێ فرۆشت با پێی بڵێت: من بەرۆژووم .

ئەو رۆژووەوانەی کە خۆی لە گوناهو تاوان نەپاراست ئەگە ر رۆژووەکەی بەتاڵیش نەبێتەوە

ئەوا خێرێکی ئەوتۆی ناهێڵێ و بێبەهرە دەبێت لە پاداشتی قیامەت ، ئەوەتە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( من لم يدع قول الزور والعمل به فليس لله حاجة في أن يدع طعامه وشرابه) رواه البخاري. واتە: کەسێک واز لە قسەی درۆو فێڵاوی و کارپێکردنی نەهێنێت، ئەوە خوا هیچ پێویستی بەوە نییە کە واز لە خواردن و خواردنەوە بهێنێت. هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: (كم من صائم ليس له من صيامه إلا الجوع ) رواه البيهقي . واتە: چەند لە ڕۆژووەوان هەیە کە لە برسێتی بەولاوە هیچی تری دەست ناکەوێت !

٢- دڵسۆزی (اخلاص) ،

دڵسۆزی مەرجێکە بۆ دروستی و پەسەندی ڕۆژو لای خوای گەورە. لەچەند جێگادا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (وإحتسابا) واتە: ئەو ڕۆژووە پەسەندەو لای خوا پاداشتی مسۆگەرە لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەنجام بدرێت، چونکە بەنەمانی ئەم مەرجە لە کارو کردەوەی موسڵمانان دەچێتە ڕیزی (منافقین)ەوەو لە ڕۆژی قیامەتدا دەدرێتەوە بە ناوچەوانی خاوەنەکەیدا.

## حیکمەتەکانی ڕۆژوو

### *(١) لە ڕووی ئیمانییەوە*

ڕۆژوو هۆکارێکی ئیمانیە بۆ پەروەردەو گەشەکردنی ڕۆح و هەوڵدان بۆ مانەوەی بە پاک و بێگەردی ، چونکە بەردەوام ئەو کەسە لە عیبادەتی خوای گەورەدایەوهەست بە زیادبوونی ئەو پەیوەندییە ئیمانیە دەکات کە لەگەڵ پەروەردگاریدا بەستوویەتی بەتایبەت لە ڕەمەزاندا سات لەدوای سات و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئەو پەیوەندییە بەهێزترو دامەزراوتر دەبێت بەم پێیەش حاڵەتی نزیک دەبێـەوە لە ژیانی فریشتەکان.

هەروەها ڕۆژوو پارێزکاری وتەقوا لە مرۆڤدا زیندوو دەکاتەوەو ترسی خوا دەخاتە دڵ و دەروونیەوە و بواری سەرپێچی لە فەرمانەکانی خوا لە عەبد تەسک دەکاتەوە چونکە هەستی چاودێری و (مراقبە)ی خوا لەناخی موسڵماندا دەچێنێت، هەر بۆیە ئەم حیکمەتە کراوە بە سەرەکیترین ئامانج و هەدەف لە گرتنی ڕۆژوودا هەروەکو قورئان ئاماژەی بۆ کردووەو دەفەرموێت:

( يأيها الذين آمنوا كتب عليكم الصيام كما كتب على الذين من قبلكم لعلكم تتقون ) البقرة/١٨٥.

هەروەهاموسڵمان لەکاتی ڕۆژووگرتندا چاکتر هەست بە نازو نیعمەتەکانی خوای پەروەردگاری‌دەکات و لە مەقامی شوکردا خۆی دەبینێتەوە

### *(٢) لە ڕووی جنسی یەوە*

غەریزەی جینسی مەترسیدارترین چەکە بەدەست شەیتانەوە کە بەکاری دێنێت بۆ سەرگەردان کردنی نادەمیزادو پاڵپێوەنەری ڕاستەوخۆی ڕەفتارە ناشیرینەکانێتی.

ڕۆژوو هۆکارێکی گرنگ و کاریگەرە بۆ دامرکاندنەوەی حەزو ئارەزووە ناپەسەندەکان و خەفەکردنی نەفس بەجۆرێک شاڵاوو تەوژمەکانی خاو دەکاتەوەو چالاکی ئەوهۆرمۆنانە لە خوێندا کەم دەکاتەوە کە پەیوەندی هەیە بە وورووژاندنی ئارەزواتی جینسییەوە

ڕۆژوو ویست و ئیرادەی موسڵمان بەهێزو دامەزراو دەکات و لە دڵەڕاوکە ڕزگاری دەبێت.

بیرکردنەوەی ناقۆلاو خەیالاتیجینسی لێ دووردەخاتەوەو لەشەڕی نەفسی (أمارة) رزگاری دەبێت لە گەنج و لاوەکاندا کاریگەری ئەم حیکمەتە دەبینرێت، هەر بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ روو دەکاتە لاوەکان و دەفەرموێت :

( یا معشر الشباب من استطاع منکم الباءة فلیتزوج فإنه أغض للبصر وأحصن للفرج ومن لم یستطع فعلیه بالصوم فإنه له وجاء) متفق علیه

واتە: ئەی لاوەکان هەرکەس لەئێوە دەتوانێت با ژن بهێنێت چونکە ژن هێنان چاو دەگرێتەوەو داوێنیش دەپارێزێت، وە ئەوەی کە لەتوانایدا نیە ژن بهێنێت با بەڕۆژووبێت چونکە ئەو کەسە لە گوناهو تاوان دەپارێزێت

کەواتە ڕۆژوو وەکو قەڵغانێک وایە بۆ پاراستنی موسڵمان لە تاوان و سەرپێچی هەروەکو پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ( الصیام جنة من النار کجنة أحدکم من القتال) صحیح الجامع الصغیرللألباني(۳۸۷۹)

هەروەها ڕۆژوو قەڵایە بۆ ئیمانداران تا پەنای پێبەرن خۆیان لە هێرش و پەلاماری شەیتان بپارێزن، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ کردووەو فەرموویەتی: ( الصیام جنة وهو حصن من حصون المؤمن) صحیح الجامع الصغیر(۳۸۸۱).

### (۳) لە ڕووی دەروونی و کەسێتییەوە

ڕۆژوو کەسێتی موسڵمان بەرز رادەگرێ، چونکە دوورکەوتنەوە لە تاوان و خراپەکاری کە لەسەرەنجامی کەم کردنەوەی چالاکی نەفس و لایەنە شەرخوازیەکەی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێ خۆی لە خۆیدا قەدرو ڕێزو کەسێتی موسڵمان بەهێز دەکات چونکە بەهۆی ڕۆژووەوە عەزم و ئیرادە بەهێز دەبێت خەسڵەتە دەروونیەکانی وەکو سنگ فراوانیو ئازایەتیو خۆڕاگری لە مرۆڤدا گەشە پێ دەدات کە ئەمانەش ڕۆڵی کاریگەریان هەیە لە توانای بەرگەگرتنی ئەو کەسە لەبەرامبەر سەختیو نارەحەتیەکانی ژیانەوە

ئادەمیزاد بۆ ئەنجامدانی هەرکارێک چاک بێت یان خراپ پێویستی بە ویست و ئیرادە هەیە، ئایینیش یا ئارامییە لەسەر کردەوەی چاکە یاخود خۆگرتنە لەسەر کردەوەی خراپ.جا بەرۆژووبوون هەردوو صەبرەکە دەگرێتەوە هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ مانگی ڕەمەزانی بە مانگی صەبر ناوبردووەو فەرموویەتی: (صوم شهر الصبر وثلاثة أیام من کل شهر یذهبن وحرالصدر) صحیح الجامع الصغیر للألباني. (۳۸۰٤)

### (٤) لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە

ڕۆژوو ڕۆڵێکی گەورەو بەرچاوی هەیە لە زیندووکردنەوەو پتەوکردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان، چونکە هەستی سۆزو خۆشەویستیو بەزەیی هاتنەوە بەهەژاراندا لە دەروونی تاکەکانی ناو کۆمەڵدا زیاد دەکات ، (ابن القیم) بەرەحمەت بێت لەم ڕووەوە دەفەرموێت: ( ڕۆژوو حاڵ و گوزەران و برسێتیو جگەربڕی هەژاران بەبیردەخاتەوە).

(ابن الهمام)یش فەرموویەتی: هەرکاتێ ڕۆژووەوان هەستی بە سەختیو نارەحەتی کرد ئەوسا بە حاڵی خۆیەوە ئەو کەسانەی بەبیردێتەوە کە تێکڕای کاتەکانی ژیانیان بەو شێوەیە بەسەردەبەن و دەستبەجێ بەزەیی بەحاڵیاندا دێتەوەو دڵی دەسووتێت بۆیان.

هەر بۆیە خوای گەورە پاداشتی گەورەی بۆ ئەو کەسانە دیاری کردووە کە ڕۆژووەوانێک لە ماڵیدا بەربانگ بکاتەوە، یاخود لە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا سەرفیترەی لەسەر موسڵمانان واجب کردووە ئەمەش بۆ ئەوەی نەدارو هەژاران بتوانن پێداویستیەکانی جەژنی پێ بکڕن

### (٥) لە ڕووی تەندروستییەوە

زانستی نوێو تاقیکردنەوە پزیشکییەکان سەلماندوویانەو گەیشتوونەتە ئەو حەقیەتەی کە ڕۆژووگرتن سوودو بایەخێکی گەورەی هەیە بۆ تەندروستی مرۆڤ و بۆ زۆرێک لە نەخۆشیەکان سوودمەندە، وەکو : نەخۆشییەکانی دڵ و فشاری خوێن و شەکرەو قەڵەوىو کۆئەندامی هەرس و زاووزێو هتد...

هەروەها چالاکی دەرهاویشتە هۆڕمۆنیەکان ڕێک دەخات، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا سەرکەوتنی لایەنی ڕۆح و گیانە بەسەر لایەنە ماددییەکەدا.. سەرکەوتنی عەقڵ و ژیریە بەسەر هەواو ئارەزووەکاندا، ئەمەش نهێنی ئەو خۆشیو شادیەیە کە هەموو ڕۆژووەوانێک هەستی پێدەکات بە تایبەت لەکاتی بەربانگ دا ( للصائم فرحتان يفرحهما: إذا أفطر فرح بفطره وإذا لقي ربه فرح بصومه) متفق عليه.

# نـــزا و پـاڕانــەوە

نزاو پاڕانەوە لە گرنگترین هۆکارە سەرەکی‌یەکانی پەیوەست بوون و پتـەوکردنی پـەیوەندیی نێـوان خـوای گـەورە و عـەبدەکانیـەتی.. لە باشـترین بەرنامـــە پەروەردەیی‌یـــەکانی پـــەروەردەی ئیمانی‌یە بۆ کەسێتیی موسڵمان، چونکە لەم ڕێگەیەوە موسڵمان ڕاستەوخۆ لەگـەڵ خـوای خۆیـدا دەکەوێتە گفتوگۆو موناجاتەوەو ڕازو نیـازی خۆی دەگەیـەنێت و داواکـانی دەخاتـە بـەر قـاپیی ڕەحمەتی خوا، کە ئەمەش سـەلماندن و بەرجەسـتەکردنی مانـای عەبدایەتی‌یـە بـۆ خـوا.. چونکـە لەلایەکەوە زەبوونی و بێ دەسەڵاتیی بەندەکان دەردەخات، لەلایـەکی تریشـەوە هـێزو دەسـەڵاتی پەروەردگار و ئاشنا بوون و تێفکران لە سیفەتە بەرزو ناوە پیرۆزەکانیەوە.

دوعاو پاڕانەوە خۆی لە خۆیدا عیبادەتێکی سـەربەخۆیە، هەروەکو پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (الدّعاء هو العبادة) رواه ابن ماجة والنسائي وأبي داود والترمذي وهو حديث حسن صحيح.. هـەروەك لە کـارە بەڕێزو خۆشەویستەکان دادەنرێت بەلای پەروەردگارەوە (ليس شيء أكرم على الله تعالى من الدعاء) رواه الترمذي وابن ماجة.

ئەو کەسـەش کە لێی ناپاڕێتەوەو داوای جێبەجێ بوونی کارەکـانی لەو زاتـە بـەرزە نـەکات لێی توڕە دەبێ و خەشمی لێدەگرێ: (من لم يسأل الله يغضب عليه) رواه أحمد.

## پێناسەی دوعا :

دوعا بریتی‌یە لەو خواست و ویستانەی کە بەشـێوەی داواو پاڕانـەوە لە خـوای گـەورە داوا دەکرێ.. (تفسير القاسمي م٢/٩٣).

یـان بریتی‌یـە لەو نـزاو پاڕانەوانـەی کـە لە نـاخ و قووڵایـی دڵـتـەوەو بـە هـەموو هەسـت و نەسـتێکتەوە؛ بـەدڵێکی دامـەزراوو یەقینـەوە ڕوو بـە بارەگـای پـــەروەردگارت دەیخەیتـە ڕوو، بەمەبەستی بەدەمەوە هاتن و قەبوڵ بوونی داواکانت و جێبەجێ بوونی ڕازو نیازەکانت) المدخل الى التصور الاسلامي/ توفيق الهاشمي ل١٤٦

هەر بۆیە خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا گرنگیی زۆری داوە بەم عیبادەتەو لە زۆر جێگادا ئاماژە بۆ ئەو دوعایانە دەکات کە هەر یەکەیان لە کـات و شـوێنی تایبـەتیدا دەخوێـنرێن و بـۆ مـەبەسـتێکی دیـاریکراو دوعایـان پـێ دەکرێـت.. بـۆ نموونـە ئـەو دوعایانـەی کـە پێغەمبـــەران کردوویانە یاخود ئەوانەی کە خوای گەورە بەمـەبەسـتی فێربوونمان ئاماژەی پێ کردوون.

داواو نیازەکانیش دوو جۆرن:

جۆرێکیان ئەو خێرو چاکانەیە کە دەتەوێ لە ئێستاو داهاتوودا دەسـتگیرت ببـێ، جۆرێکـی تریان ئەو زەرەرو ناڕەحەتی‌یانەیە کە ئێستا پێوەی دەناڵێنی و دەتەوێ لەسەرت لابەرێ، یـاخود دەترسی لە داهاتوودا دوچارت ببێ.. هـەر بۆیـە (ئەنـەس) (ڕەزای خـوای لێبێـت) فەرموویـەتی: زۆوترینی دوعـای پێغەمبـەر ﷺ ئەمـەبوو: (اللهمّ آتنا في الدنيا حسـنة وفي الآخرة حسـنة وقنـا عذاب النار) رواه مسلم.

## حیكمه ت و سووده‌كانی نزاو پاڕانه‌وه:

١. به‌خشینی نارامی به دڵ و ده‌روون و زیادبوونی گومانی باش به په‌روه‌ردگار.
٢. زیادبوونی ئیمان و پته‌و بوون و دامه‌زراوی له ناست پێشهاته خۆش و ناخۆشه‌كانی ژیان، به‌جۆرێك كه خۆڕاگر بێ و سنووری شه‌رع بپارێزێت له هه‌ردوو حاڵه‌ته‌كه‌دا.. پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: (عجباً لأمر المؤمن إن أمره كله خير، وليس ذلك إلاّ للمؤمن. إن أصابته سرّاء شكر فكان خيرا له.. وإن أصابته ضرّاء صبر فكان خيرا له) رواه مسلم.
٣. هه‌ستكردن به هیممه‌ت به‌رزی و زیادبوونی متمانه به‌خۆ، چونكه پشت ئه‌ستووره به هێزو ده‌سه‌لاتی خوای گه‌وره.
٤. زادو توێشووی بانگخوازانی ڕێگای خوایه‌و گوڕو تینی زیاتری پێ ده‌داو له ژیاندا دڵخۆشیان ده‌كات.

به‌لام پێویسته موسڵمان چاك بزانێ كه هه‌ر كاتێك په‌له‌ی گیرا بوونی دوعاكانی كردو نیازه‌كانی زوو حاسڵ نه‌بوو، یاخود قه‌بوڵ بوونی نزاكانی به دوور زانی، ئه‌و كاته وه‌كو ده‌ردێك ئه‌و ناسه‌وارو حیكمه‌تانه‌ی سه‌ره‌وه له‌ده‌ست ده‌داو حاڵه‌تێكی بێ هیوایی تیا دروست ده‌كاو، ئه‌مه‌ش ده‌یگه‌یه‌نێت به‌و سه‌ره‌نجامه خراپه‌ی كه ئیتر واز له دوعا كردن بێنێ، كه بێگومان هه‌ركه‌س بكه‌وێته ئه‌و حاڵه‌تانه‌وه بارو دۆخی ئیمانیی تێك ده‌چێت و پاك و بێگه‌ردییه‌كه‌ی ناهێڵێ.. هه‌ر بۆیه پێغه‌مبه‌ری نازیزمان ﷺ ئاگادارمان ده‌كاته‌وه به‌وه‌ی ئه‌وكاته دوعاكانمان له قاپی خوا وه‌رناگیرێ كه په‌له‌په‌لمان پێ ده‌كه‌وێت و چاوه‌ڕوانی زوو گیرابوونی بكه‌ین، هه‌روه‌ك ده‌فه‌رمووێ: (يستجاب لأحدِكم مالم يعجّل يقول: دعَوت ولم يستجب لي) رواه البخاري.

یاخود ده‌فه‌رموێ: (لايزال يستجاب للعبد مالم يستعجل! قيل يارسول الله ما الإستعجال؟ قال: يقول قد دعوت وقد دعوت فلم أرَ يستجب لي. فيستحسر عند ذاك ويَدع الدعاء) رواه مسلم.

## مه‌رجه‌كانی گیرا بوونی نزا:

١ - ڕاسته‌و خۆ له خوای خۆی بپاڕێته‌وه، چونكه قورئان ده‌فه‌رمووێ: ﴿وإذا سألك عبادي عني فإني قريب..﴾ البقرة/١٨٦.
٢ - حه‌لاڵیی له خواردن و خواردنه‌وه‌و له‌به‌ركردندا، ئه‌وه‌ته پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێ: (..الرجل يطيل السفر أشعَث أغبرَ يمدّ يده إلى السمآء: ياربّ ياربّ! ومطعَمُه حرام ومشربه حرام وملبسه حرام وغذي بالحرام. فأنّى يستَجابُ لذلك..؟).
٣ - دوعای خراپه‌و زه‌ره‌رو زیان له خۆی و ماڵ و منداڵی نه‌كات، ئه‌وه‌كو ڕێكه‌وتی ئه‌و كاتانه بكات كه خوا نزای تێدا قبوڵ ده‌كات.. پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: (لا تدعوا على أنفسكم ولا تدعوا على أولادكم ولا تدعوا على أموالكم، لا توافقوا من ساعة يسأل فيها عطاء فيستجيب لكم) رواه مسلم.
٤ - دوعایه‌ك نه‌بێ بۆ تاوان و سه‌رپێچی یان په‌یوه‌ندیی ڕه‌حم و خزمایه‌تیی بپچڕێنێ. پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: (لا يزال يستجاب للعبد ما لم يدع بإثم أو قطيعة..) رواه مسلم.
٥ - به نیه‌تی پاك و به دڵێكی به ئاگاو به هه‌ست و هۆشی ته‌واوه‌وه بپاڕێته‌وه‌و دڵنیابێ كه خوای گه‌وره (ئیستیجابه)ی دوعاكه‌ی ده‌كات.. پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رموویه‌تی: (أدعوا الله وأنتم

موقنون بالإجابة. واعلموا أن الله لا يقبل دعاء من قلب غافل لاهٍ) رواه الترمذي والحاكم وصححه الألباني

(ابن القيم) به ڕەحمەت بێ له كتێبی (الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي) دا دەفەرموێ :

١.نزاو پاڕانەوە لە بەهێزترین هۆكارو ئەسبابەكانە بۆ لابردنی ناڕەحەتی و پێشهاتە خراپەكان و گەیشتن بە خواست و حەزەكان، بەڵام دەگونجێ ئەو دوعاو پاڕانەوانە هیچ ڕۆڵێك نەبینێ و كاركرد و تەئسیری نەبێت، ئەویش هۆكەی دەگەڕێتەوە یان بۆ خودی دوعاكە خۆی، بۆ نموونە دوعایەك بێ كە خوا پێی ڕازی نەبێ و دەرچوون بێت لە سنووری شەرع ، یان لە كاتی پاڕانەوەكاندا غەفلەت و بێ ئاگایی ڕووبكاتە دڵەكان و بە تەركیزەوە دوعاكان نەخوێنێ، ئەوكاتە وەكو ئەو تیرەی لێ دێت كە بەخاوی لە كەوانەكەی دەردەچێ.. یاخود بەربەستێك هەیە لە ڕێی گیرابوونی دوعاكەیدا وەكو حەرام خواردن و زوڵم و زۆرداری و ، هتد.

## ئەو كاتانەی كە ئومێد زۆرە دوعای تێدا گیرا بێت :

ئەگەر لەكاتی دوعاو پاڕانەوەدا هەموو هەست و هۆشێكت ئامادە بوو و، دڵت لەلای وشەو داواكانت بوو و ڕێكەوتی یەكێك لەم كاتانەی لای خوارەوەی كرد ئومێدی زۆر هەیە كە خواوەند نزاكانت لێ وەربگرێت و داواكانت بۆ جێبەجێ بكات، لەوانە

١ - سێ یەكی كۆتایی شەو (الثلث الأخير من الليل) : موسڵمانی دڵسۆزو تێكۆشەر دەردە دڵ و سكاڵای زۆرە بەهۆی ئەو ئەركە زۆرانەی كە لە ئەستۆیدایە، مەگەر لە شەودا ماندوێتی ڕۆژی بحەوێنێتەوەو لەگەڵ پەروەردگاریدا (مناجاة) بكات و بە ئارەزووی دڵی خۆی لێی بپاڕێتەوە بەمەش گوڕو تینێكی زیاتری دەداتێ، هەتا چالاكانە خزمەت بە ئیسلام و موسڵمانان بكات، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ لە فەرمودەیەكی قودسیدا دەفەرموێ : (يتنزل ربّنا كلّ ليلةٍ إلى السماء الدنيا حين يبقى ثلث الليل الأخير فيقول: من يدعوني فأستجيب له، ومن يسألني فأعطيه، ومن يستغفرني فأغفر له) رواه البخاري ومسلم

واتە: هەموو شەوێك خوای گەورە لە سێ یەكی كۆتایی شەودا دادەبەزێتە ئاسمانی دنیاو دەفەرمووێ: كێ لێم دەپاڕێتەوە هەتا وەڵامی بدەمەوە، كێ داوام لێ دەكات تا بیدەمێ، كێ داوای لێخۆش بوون لە تاوانەكانیم لێ دەكات هەتا بیبەخشم .

٢ - لەنێوان بانگ و قامەتدا: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ : (لا يُرَدّ الدعاء بين الآذان والإقامة) رواه أبو داود والنسائي وقال حديث حسن صحيح.

٣ - دوا كاتەكان لە پاش عەسری ڕۆژی هەینی: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (إنّ في الجمعة ساعة لا يوافقها عبد مسلم يسأل الله عز وجلّ فيها خيراً إلاّ أعطاه إياه وهي بعد العصر) رواه أحمد وقال العراقي حديث صحيح .

٤ - كاتێكی دیاری نەكراو لە ڕۆژی هەینیدا (فيها ساعة لايوافقها عبد مسلم وهو قائم يصلي يسأل الله شيئا إلا أعطاه إياه. وأشار بيده يقللها) متفق عليه

٥ - لە پاش نوێژە فەرزەكان: پرسیار لە پێغەمبەری خوا كرا كە ئایا كام دوعا زیاتر قبوڵە؟ ئەویش فەرمووی: ئەو دوعایانەی كە لە كۆتایی ناوەڕاستی شەودا و لە پاش نوێژە فەرزەكان دەكرێن.. ترمزی بە سەنەدی صحیح گێڕاویەتیەوە.

لە كاتی سوجدە بردندا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : (أقرب ما يكون العبد من ربه وهو

ساجد فأكثروا الدعاء) رواه مسلم (..وأما السجود فاجتهدوا في الدعاء فقمن أن يستجاب لكم) رواه مسلم

٦ - له کاتی بانگدان و ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (ثنتان لا تردان -أو قال ما تردان- الدعاء عند النداء وعند البأس حين يلحم بعضهم بعضا) رواه أبوداود بإسناد صحيح .

٧ - کاتی ڕۆژوو شکاندن: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (إن للصائم عند فطره لدعوة ما ترد) رواه إبن ماجه بسند صحيح .

## ئادابی دوعا کردن :

١- هەر دوو دەستی زەلیلی بەرەو بارەگای خوا بەرز بکاتەوەو بەسوپاس و ستایشی خوای گەورە دەست پێ بکاو ئینجا صە لات و سەلام لەسەر پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بدات.

٢- داوا کردن بە ناوە پیرۆزو جوانەکانی خوای گەورەوە ﴿و لله الأسماء الحسنى فادعوه بها﴾ الأعراف/١٨٠.

٣- بەر لەوەی بپاڕێیتەوە ئەو نازو نیعمەتانەی تر بخەرەوە یادت کە پێتی بەخشیوە و، پاشان داوای لێبووردن و لێخۆش بوون لە خوای خۆت بکەو پەشیمانی خۆت دەر ببڕە، ئینجا داواکانت عەرز بکە.

٤- دوعاکانت بە لاڵانەوەو بە نهێنی و دوور لە هەراو دەنگی بەرز بێت و، نەکەی ئەو سنوورە ببەزێنیت چونکە قورئان دەفەرموێ : ﴿أدعوا ربكم تضرعاً وخفيةً إنه لا يحب المعتدين﴾ الأعراف/٥٥، وە لە باسی دوعاکەی حەزرەتی (زكريا)دا دەفەرموێ : ﴿إذ نادى ربه نداءً خفياً﴾ مريم/٣.

٥- زۆر دوبارە کردنەوەو ئیلحاح و زۆر کردن لە دوعاکاندا چونکە خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێ کە زۆر دەکەن لە پەروەردگاریان لەکاتی پاڕانەوەدا.

٦- هەوڵ بدە لەکاتی نزاو پاڕانەوەکانتا هاوسەنگی بدە بەباری دڵ و دەروون و ئیمانت، بەوەی لە هەردوو حاڵەتی ترس و هیوا (الخوف والرجاء)دا بیهێڵیتەوەو بواری زیادەڕەوی نەدەیت لە هیچ کامیاندا.. ئەوەتا خوای گەورە لە باسی ئەوانەدا کە شەونوێژ دەکەن دەفەرمووێ: ﴿تتجافى جنوبهم عن المضاجع يدعون ربهم خوفاً وطمعاً ومما رزقناهم ينفقون﴾ السجدة/١٦.. وە لە باسی حەزرەتی (زكريا)دا فەرموویەتی: ﴿إنهم كانوا يسارعون في الخيرات ويدعوننا رغباً ورهباً وكانوا لنا خاشعين﴾ الأنبياء/٩٠.

٧- ئەو دوعایانە بێت کە لە پێغەمبەری خواوە ڕیوایەت کراون و (مأثور)ن، بەتایبەت ئەو نزایانەی کە ناوی (إسم الأعظم)ی تیا بردوە.. بۆ نموونە: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ گوێی لە کابرایە بوو ئەم دوعایەی دەخوێند: (اللهمّ إنّي أسألك بأني أشهد أنك أنت الله لا اله إلاّ أنت الأحدُ الصمَد الذي لم يلد ولم يولَد ولم يكن له كُفواً أحد..) رواه إبن حبان في صحيحه، پێغەمبەریش فەرمووی: بە ناوێکی وا گەورەو بەرزەوە لە خوا پاڕایتەوە، ئەگەر داوای پێ بکەیت دەتدرێتێ و، ئەگەر پێی بپاڕێیتەوە وەڵامت دەدرێتەوە.

## ڕەواندنەوەی گومانێک :

هەندێ کەس وا گومان دەبەن ئەو قەدەرانەی کە خوای گەورە لە چارەی عەبدەکانی نووسیوە هەر ئەبێ ڕوو بدات و هیچ شتێک ناتوانێت بەربەرچی ئـەو پێشهاتانە بداتـەوەو بیانگێڕێتـەوە.. بێگومان ئەم تێڕوانین و بۆچوونە زۆر هەڵەیە، لەبەر ئەم هۆیانە:

(١)لە عـەقیدەی ئیسلامیدا نزاو پاڕانەوە لە پاڵ هۆکارەکانی تردا بە هۆکارو سەبەبێکی گرنگ و کاریگەر دادەنرێ.. ڕۆڵی گەورەی لە چەندەها گۆڕانکاریی مێژوو بینیـوەو، بـارو دۆخـی تـاک یان کۆمـەڵی ئـاڵوگۆڕ پێکـردووەو، دیـاردەو حاڵەتـەکانی ژیـانی لە بارێکـەوە بردۆتـە سـەر بارێکی تر.. بۆ نموونە: لە قورئاندا لە چەندەها شوێندا باسی ئـەو حاڵـەت و گۆڕانکارییانـە دەکات کە لە ناکامی گیرا بوونی دوعا و نزای پێغەمبەرانەوە دروستبوون.

(٢)هەموو قەزاو قەدەرێک لە پاش ویست و ئیرادەی خوای گەورە لە ناکـامی پێکـەوە گرێـدان و کاریگەریی کۆمـەڵە (اسباب)ێکەوە ڕوو دەدەن، یەکێک لەوانە دوعایـە.. بۆیـە هـەر کـاتێک ڕووداوێک ڕوو بدات ڕاست نییە بڵێیت دوعاکردن سوودی نییە؛ چونکە وەکو ئەوە وایە بڵێـی خواردن و خواردنەوەو کردەوەی چاکیش سوودی نییە.. لەبەر ئەوە هیچ شتێک ئەوەندەی نـزاو پاڕانەوە قازانج و سوود بەخش نییە بـۆ دەستخسـتنی ویسـت و خواسـتەکانی عـەبد، چونکـە دڵنیایە لە مانای ئەو ئایەتەی سورەتی (فاطر) کە دەفەرموێ: ﴿ما یفتح ا لله للناس من رحمة فـلا ممسك لها وما یمسك فلا مرسل له من بعده وهو العزیز الحکیم﴾ . هەر بۆیـە هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ لە هەموو کەس زیاتر پابەند بوون بە مەرج و ئادابەکانی دوعاوەو، وەکو چەکێکی بەهێزو کاریگەر بەکاریان هێناوە.. ئەوە حەزرەتی عومەرە بەو هۆیەوە بەسەر دوژمنـدا سـەردەکەوێ لە کاتێکدا خاوەنی لەشکرێکی گەورەو بەهێز بوو.. بە هاوەڵانی دەوت: (لستم تنصـرون بکثرة وإنما تنصرون من السماء).. هەروەها بە دڵنیایییەوە پێی ڕاگەیاندن : من ئەوەندە بەپەرۆشـەوە نیم بۆ گیرا بوونی دوعاکان بـەڵکو پەرۆشـی دوعـا کـردن دەخۆم، خۆ ئەگـەر خـوای گـەورە ئیلهامی پێ بەخشیم و توانیم سەرکەوتووانە لەخوا بپاڕێمەوە بێگومان جوابەکەی بە شـوێندا دێت و گیرا دەبن. (إني لا أحمل همّ الإجابة ولکن همّ الدعاء فإذا أُلهمتُ الدعاء فإنّ الإجابة معه).

(٣)ئەو جۆرە بیرکردنەوانە وەسوەسەی شەیتانەو جۆرێک هیوا بڕان لە ڕەحمی خـوا دەردەخـات و نیشانەی کزبوونی ئیمانە لە دڵ و دەروونی ئەو کەسەداو پێچەوانەیە لەگەڵ ئەو هەموو بـەڵێن و پەیماناتـەی کـە خواوەنـد داوێتـی بەبـەندەکانی، چونکـە فەرموویـەتی: ﴿ادعوني أسـتجب لکم..﴾ ، ﴿وإذا سألك عبادي عني فإني قریبٌ أجیب دعوة الـداع إذا دعـان..﴾ .. یـاخود لەسـەر زمانی حەزرەتی (زکریا)وە فەرمویەتی : ﴿.. ولم أکُن بدعآءك ربّ شقیاً﴾.

(٤)جا هەر دوعایەک بە نیازێکی پاکەوە بکرێ و ڕەچاوی مەرجی دوعا گیرابوونی تیا بێتـە دی، بێگومان ئەو دوعایە وەڵام دەدرێتەوە بەڵام درەنگ و زوویـی پـەیوەندیی بـە عیلـم و زانینـی خوای گەورەوە هەیە.. تەنانەت -لەبەر هەندێ حیکمەت- جاری وا هەیـە لـە ڕۆژی قیامـەتدا دەیکا بە زەخیرە بۆ عـەبدەکەی.

(٥)نزاو پاڕانـەوە سوودبەخشـترین دەرمانـە و دوژمنـی بـەڵا و پێشـهاتە ناخۆشـەکانەو، ڕێگـای دابەزینیان لێدەگرێت بە شێوەیەک، یان بەربەرچی ئەو قەدەرانە دەداتـەوە و دەیانگێڕێتـەوە.. یاخود لە کاتی دابەزینیاندا سـەختی و زیانیان لەسەر دڵ و دەروون سـووک و کـەم دەکاتـەوە..

کەواتە دوعاکردن لەهەردوو بارەکەدا سوودمەندە و نابێ موسڵمان دەست بەرداری ببێ..
ئەوەتە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت : (الدعاء سلاح المؤمن وعماد الدين ونور السماوات والأرض وله مع البلاء ثلاث مقامات: أحدها أن يكون أقوى من البلاء فيدفعه.. الثاني أن يكون أضعف من البلاء فيقوى عليه البلاء فيصاب به العبد، ولكن قد يخففه وإن كان ضعيفا.. الثالث أن يتقاوما ويمنع كل واحد منهما صاحبه) رواه الحاكم في صحيحه

(٦)(الدعاء ينفع مما نزل ومما لم ينزل ، فعليكم يا عباد الله بالدعاء) حسّنه الألباني في صحيحه رقم الحديث/٣٤٠٩

## لە کۆتاییدا دەڵێین

پێویستە لەسەر موسڵمان هەمیشە و لە هەموو کات و حاڵەتێکیدا بە دڵگەرمییەوە زیکرو یادی خوا بکا و بە نازەوە لێی بپاڕێتەوە و داوایخێری دنیا و قیامەتی لێ بکات..

داوای سەقامگیری و (استقامە)ی لێ بکات..

داوای لێخۆشبوون لە گوناھ و کەموکوڕی و ناتەواوییەکانی لێبکات..

داوای ساغ و سەلامەتیی لاشە و عاقیبەت خێریی لێبکات.

داوای کۆمەکی و تەوفیقاتی خوایی لە گشت کارو کردەوەکانیدا بکات.

ئەم دوعایانە و جۆرەها دوعای تر کە موسڵمان ڕۆژانە پێویستی پێی دەبێ و ڕێی تێ دەکەوێت دەبێ بیانزانێ و لەبەریان بکات بە تایبەت دوعا قورئانییەکان و ئەو دوعایانەی کە لە پێغەمبەری خۆشەویستمانەوە ڕیوایەت کراون و (مأثور)ن.

**واخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين.**

## سەرچاوەکان:


(١) قورئانی پیرۆز
(٢) تەفسیری (القاسمی)
(٣) سبحانك اللهم
(٤) رياض الصالحين/ النووي
(٥) الجواب الكافي لمن سأل عن الدواء الشافي / ابن القيم

# چــاو پــاراســتن

یەکێک لەبەخششەکانی خوای گەورە بەسەر مرۆڤەوە، چاوەکانیەتی. چاو هۆیەکی گرنگە بۆ وروژاندنی هەموو هەست و نەستی نادەمیزاد وە پلەی یەکەمە لە پەیژەی سەرکەوتن بۆ تاوان و گوناهی گەورە، کەواتە پێویستە لەبەکارهێنانی چاودا زۆر وریابین، وە بەو شێوەیەی کە خوایگەورە پێی خۆشە بەکاریبهێنین.

## چۆنیەتی خۆپاراستن :

ناشکرایە ئێمە بۆ تەندروستی لاشە دروشمی (خۆپاراستن لە چارەسەرکردن باشترە)مان بەرزکردۆتەوە.. دەکرێ هەمان دروشم بۆ خۆپاراستن لە دەردو بەلاکانی رەوشتیش بەرزبکەینەوە.

بێگومان خەڵکی بەسروشت رازی نین و ماڵ و سامانیان بەهەدەر بچێ، ئیتر چۆن رازی دەبن ناموس و کەرامەتیان لەکەدار بکرێ، لەکاتێکدا ناموس و کەرامەت زۆر لە ماڵ و سامان گرنگترە، وە بۆ ئەو مەبەستە ئەم چەند خاڵە دەخەینە پێش چاوی ئیمانداران :

## یەکەم : چاوپاراستن :

چاو یەکێکە لە هۆکارەکانی وروژاندنی نارەزوو (جنس) لە نادەمیزاددا، وە لەوێوە سەرەتای لادان دروست دەبێت و مرۆڤ بەرەو خەجاڵەتیو شەرمەزاری دەبات.

## چاوپاراستن بەمانای نەفس پاراستنە :

ئەگەر سەرنج بدەی لەو لاوانەی کە لەخوا ناترسن و چاویان ناپارێزن، دەبینی کە هەڵس و کەوتیان و چاوگێڕانیان، قسەو گوفتاریان سروشتی نییەو ناماژەیە بۆ دڵەڕاوکێو دانەمەزراوی دڵ و دەروونیان، جا ئەگەر کەسێک لەترسی خوا چاوی پاراست لە تیرە ژەهراویەکانی شەیتان، بەروەردگاریش ناسوودەیی دەرژێنێ بەسەر دڵ و دەروونیدا.

قورنان دەفەرموێت: ( قل للمؤمنين يغضوا من أبصارهم ويحفظوا فروجهم ذلك أزكى لهم إن الله خبير بما يصنعون، وقل للمؤمنات يغضضن من أبصارهن ويحفظن فروجهن...) . النور/٣١،٣٢.

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بە پیاوە ئیماندارەکان بڵێ: کە چاویان لەناستی تەماشای حەرام و داوێنیان خاوێن راگرن.. ئەوە پاکترو خاوێنترە بۆدڵ و دەروونیان.

بێگومان خاوەند ناگادارە بە هەموو ئەو کارو نیشانەی کە دەیکەن.. هەروەها بە نافرەتە ئیماندارەکان بڵێ: کە چاویان بپارێزن لە ناستی نامەحرەم دا، وە دامێنی خۆیان بپارێزن، پێغەمبەریش ﷺ لەفەرموودەیەکدا فەرموویەتی: ( لا تتبع النظرة النظرة، فإنما لك الأولى وليست الأخرى). حسنه الألباني في كتابه صحيح سنن الترمذي، رقم الحديث/٢٢٢٩.

واتە: تەماشا مەکە بەشوێن، یەکداو دووبارەی مەکەرەوە، یەکەمجار قەیناکا، بەلام دووهەمجار بۆت نییەو بە گوناه بۆت دەنوسرێت.

جا بەڕاستی لە دووبارەکردنەوەی تەماشادا شەیتان خەتەرەو خەیاڵی خراپ دەخاتە دڵەوەو، وامان لێ دەکات گوناهەکان بەشوێن یەکدا ئەنجام بدەین.

هەروەها فەرموویەتی: (أكفلوا لي بست أكفل لكم الجنة: إذا حدث أحدكم فلا يكذب، وإذا اتمن فلا يخن، وإذا وعد فلا يخلف، وغضوا أبصاركم وكفوا أيديكم واحفظوا فرجكم ) رواه الطبراني والبغوي وصححه الألباني في صحيح جامع الصغير. رقم الحديث/١١٢٥

واتە: ئێوە شەش شتم لە خۆتانا بۆ بهێننەدی من دەبمە زامنی بەهەشت بۆتان، کاتێ قسەدەکەن راستگۆبن، وە کاتێ کە بەڵێنتان دا بیبەنە سەر وە کە ئەمانەتتان لا دانرا بیدەنەوە بە خاوەنی، داوێنتان پاک راگرن، چاوتان بپارێزن، دەست مەوەشێنن

هەروەها فەرموویەتی: ( ما من مسلم ينظر إلى محاسن إمرأة ثم يغض بصره إلا أحدث الله له عبادة يجد حلاوتها في قلبه) رواه أحمد والطبراني

واتە: هەر موسڵمانێک (لەغەفڵەتێکدا یان لە ناکاوێکدا) چاوی کەوت بە جوانی نافرەتێک، دوایی رووی وەرگێڕاو چاوی پاراست (لە ترسی خوا) خوای گەورە بەپەرستن بۆی حساب دەکات و هەست بە شیرینی و تام و چێژی دەکات لە دڵ و دەروونیدا.

لە فەرموودەیەکی تردا هاتوە: ( ثلاثة لاترى أعينهم النار: عين حرست في سبيل الله وعين بكت من خشية الله وعين كفت عن محارم الله) رواه الطبراني.

واتە : سێ جۆر کەس هەیە کە چاویان بەئاگری دۆزەخ ناکەوێ و تیایدا ناسوتێن، یەکەمیان ئەو چاوەی کە پاسەوانیی بکا لەبەر خوای گەورە، دووهەمیان خاوەنی ئەو چاوەی کە دەگری لە ترسی خوا سێیەمیان خاوەنی ئەو چاوەیە کە دەیپارێزێ لە حەرام کراوەکانی خوا.

جا ئەوەی دەیەوێ رەزامەندی خوا بەدەست بێنێ، با لەم سێ بوارە پیرۆزەدا چاوی بەکار بێنێت.. بەتایبەت کە باسەکەمان چاو پاراستنە با لاوانمان دان بە خۆدا بگرن، چونکە خۆگرتن زۆر ئاسانترە لەو سزایەی چاوەڕێی دەکات.. ئەمڕۆ ئەگەر نەتوانین لەبەرانبەر هێرشی ئارەزووەکانەوە خۆگربین، داخۆ سبەی چۆن دەتوانین لەبەرانبەر شاڵاوی ئاگرو ئەشکەنجەو ئازاری دۆزەخ دا خۆبگرین .

## سوودەکانی چاوپاراستن :

چاوپاراستن گەلێک سوودی هەیە، (ابن القيم) لە کتێبی (الجواب الكافي)دا بەم شێوەیە باسی سوودەکانی دەکات:

(١) جێبەجێکردنی فەرمانی خوا کە دەبێتە هۆی بەختەوەری ئادەمیزاد لە دنیاو قیامەتدا.

(٢) نایەڵێت تیری ژەهراوی بگاتە دڵ و ببێتە هۆی تیاچوون.

(٣) دڵان وا لێ دەکات کە بەردەوام هەست بە نزیکیو چاودێری خوای گەورە بکەن .

(٤) دڵ خۆش و کامەران دەکات، بەپێچەوانەی چاولەوەڕاندنەوە کە پەستیو غەمباری دێنێتە پێشەوە.

(٥) دڵ و دەروون رووناک دەکات، بێ حیکمەت نییە کە فەرمان بە چاوپاراستن لە سوورەتی (نور)دا هاتووە دوای ئایەتی (الله نور السماوات والأرض مثل نوره كمشكاة فيها مصباح المصباح ..) . جا هەندێ لە زانایان دڵی باوەڕداریان بەو نورەی پەروەردگار داناوە کە بەهۆی پاکیەوە تێکەڵ بە نوری ئیمان و نوری پەروەردگار دەبێت و دەوروبەر رووناک دەکاتەوە.

(٦) فەراسەت و جیاکردنەوەی حەق لە بەتاڵ و چاك لە خراپ دەست دەکەویت، پیاوچاکێك بەناوی (شجاع) لەو بوارەدا دەفەرمویت :

ئەوەی رواڵەتی خۆی بەشوێن کەوتنی سوننەتی پێغەمبەرە وە ﷺ دەروونی بە هەست کردنی بەردەوام بە چاودێریکردنی پەروەردگار ئاوەدان بکاتەوە، وە چاوی لەگوناهان و حەرامییەکان بپارێزێ وە خۆی لە شتە گومان لێکراوەکان پەرێز گرت و، حەلاڵی خواردو خۆی لە حەرام پاراست. ئەوە فەراسەت و بۆچوونی راست و دروستی بۆ دروست دەبێت، شایانی باسە زۆرجار خوای پەروەردگار پاداشتی بەندەی لە دنیادا بەگوێرەی کردەوەکانی دەداتەوە، ئەوەی لەبەرخوا واز لە گوناهان بێنێت ئەوە لە نازو نیعمەتی حەلاڵ بەهرەوەری دەکات، بۆ نموونە کاتێ چاوی دەپارێزێ سنووری بۆ دادەنێت پەروەردگار بیروهۆش و دەروونی روون دەکاتەوە.

(٧) دڵ دامەزراوو بەهێز دەکات، هەروەك وتراوە ئەوەی دژی ئارەزووی بوەستێ، شەیتان لە سێبەری دەترسێ.

(٨) سەرگەرمی ئەو شتانە دەبێت کە بەرژەوەندی دنیاو قیامەتی تیایە، بەلام تەماشای نامەحرەم ، خۆت و بەرژەوەندیەکانت لەبیردەباتەوە، هەواوئارەزوو بەرچاو تاریك دەکات و ، دڵ غافڵ دەکات، جا دەبێت ئەك هەوڵ بدەین خۆمان لەجۆرە حاڵەتە بپارێزین، بەڵکو دەبێت خۆمان دوورەپەرێز بگرین لەو کەسانەش کەهەست دەکەین دڵیان غافڵەو یادی پەروەدگاریان ناکەن و شوێنی ئارەزووەکانیان کەوتوون و کارو کردەوەکانیان بێ سەروبەرە.. چونکە خوای گەورە لە قورئاندا ئەو فەرمانەمان پێ دەدات: (ولا تطع من أغفلنا قلبه عن ذكرنا واتبع هواه وكان أمره فرطا) . الكهف/٢٨.

هەروەها دەبارەی (خەتەرەو خەیاڵ) ( ابن القيم) لە کتێبی (الجواب الكافي) دا دەڵێت :

(خەتەرۆ خەیاڵ سەرەتای شەرو خێرە، چونکە لەوێوە ویست و خواستی نادەمیزاد دەجولێ و دەست پێدەکات، لەبەرئەوە چاودێری بەردەوامی نەفس پێویستە، تا زاڵ بین بەسەر خواستە نادروستەکاندا، وە هەمیشە ئامادەی جێبەجێکردنی هەموو خواست و داخوازییە دروستەکان بین . بیرمان نەچێت کە خەتەرەو خەیاڵی دڵ و دەروون بێسنوورەو زۆرجار بەرەو شتی دوور لە واقع دەمانکێشێ )

چونکە ئەم جۆرە خەتەرەو خەیالانە تۆوێکە شەیتان دەیوەشێنێت دوایی ئاودێری دەکات تا دەبێە ویست و خواست، وە بەردەوام کۆڵ نادات، تا دەیکاتە کردارو، نادەمیزاد تووشی هەڵەو گوناه دەکات و خەجاڵەت و ریسوایی دنیاو قیامەتی بەسەردێنێ.

امامی شافعی -بەرەحمەت بێت- دەفەرمویت :

نەفس و دڵ و دەروونت ئەگەر سەرگەرمیان نەکەیت بە حەقەوە ئەوا بە ناحەق و بەتاڵەوە سەرگەرمت دەکەن .

**ئەنجامدانی کاری چاکە :**

بۆ سەرگەرم کردنی نەفس بە کاری چاکەوە پێویستە بۆ ئەم شتە بە سوودانە ئاراستەی بکەین:

(١) بیرکردنەوەی قووڵ لە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و هەوڵدان بۆ پەیڕەوی کردنی ..

(٢) بیرکردنەوە لەم بوونەوەرە سەرسورهێنەرەو لەدەسەڵاتی بەدیهێنەری
(٣) بیرکردنەوە لە نازو نیعمەتەکانی خوای گەورە
(٤) بیرکردنەوە لە پەیوەندی نێوان پەروەدگارو بەندەکانی تا عیبادەتەکان بەچاکی ئەنجام بدەین

(٥) کات بەسەربردن لە ئەنجامدانی کارو شتی بەسووددا.
(٦) هەوڵدان بۆ رێک خستنی کاروباری رۆژانەمان بەشێوەیەکی رێک و پێک
(٧) بەئەنگەوەبوونی بارودۆخی جیهان بەگشتی، وە جیهانی ئیسلام و گەلی کوردی موسڵمان بەتایبەتی
(٨) پەیوەندی کردن بە خزمان و دراوسێکان و ناسیاوانەوەو بەجێهێنانی (صیلەی رەحم)
بۆ ئەنجامدانی ئەو مەبەستەش پێویستە :
(١) خۆمان بەچاکی شارەزای قورئان بکەین، وە هەوڵ بدەین لە مانا و داخوازییە پیرۆزەکانی تێبگەین .
(٢) خۆمان شارەزا بکەین لە ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ
(٣) ئاسۆی بیرو رۆشنبیری گشتیمان فراوان و زیاد بکەین لەرێی موتاڵاکردنی بەردەوامەوە.
(٤) با ئەوە لەیاد نەکەین کە خەو جۆرە مردنێکەو کێ دەڵێ خەوەکەمان یەکجاری نییە. لەکاتی نووستندا فریشتەیەک و شەیتانێک لەدەوری سەری هەر موسڵمانێک دەوەستن تا خەوی لێ دەکەوێ، فریشتەکە دەڵێت دەی بەخێر خەوی لێ کەوێ، شەیتانەکەش دەڵێت دەی بەشەڕ خەوی لێ کەوێ..
(٥) کاتێک خەتەرەو خەیاڵی خراپ و شەیتان زۆری بۆ هێنایت هەستان و جێگۆڕکێ سوودی هەیەو چاکترە لە تەپاوتل کردن.
(٦) چاک وایە لە ژووری نووستنەکەماندا بەرانبەر جێگەی خەو هەندێ ئایەت و فەرموودە هەڵواسین کە قیامەت و مردن یاد بخەنەوە
(٧) هەوڵدان بۆ ئەوەی کاتمان بەفیرۆ نەڕوات و هەمیشە خۆمان خەریک بکەین بە کارێکی بەسوودەوە.

## دووەم : دوورەپەرێزی لەو شتانەی کە غەریزەی جنسی دەبزوێنن :

بێگومان لە کۆمەڵگای ئەمڕۆماندا لاوی ئیماندار گیری خواردووە لە نێوان ترسی خواو ئەم هەموو زەرق و بەرقەدا، کە دەبینێ ئەو ئافرەتانەی کە ترسی خوایان لە دڵدا کەمە، بەتەواوی خۆیان دەرازێننەوەو خۆیان دەنوێنن، ئەمە جگە لە گۆرانیو سەمای تەلەفزیۆن و بەرنامەی بەرەڵاو بێئابڕووەکانی سەتەلایت، جا ئیتر پیاو ئەو پیاوەیە، لاو ئەو لاوەیە لە زۆرانبازیو زۆرهێنانی شەیتانەکاندا نەڕوخێو بیر لە کاری نادروست نەکاتەوەو وەک نەفس پەرستەکان بیرنەکاتەوە.

•دەبێت لاوی ئیماندار خۆی نەخاتە بارودۆخێکەوە کە تەنهابێ لەگەڵ ئافرەتێکدا، چونکە شەیتان سێهەم دەبێت.

•هەروەها دەبێ باوکان بەردەوام لە بیری رەوشتی منالەکانیان دا بن و لە حەوت سالیەوە هانیان بدەن بۆ نوێژو خواپەرستی، وە لە دە سالیشدا دەبێت هەرکەس جێگەی خۆی جیابکرێتەوە.

•دەبێت هۆشیاربین، گۆڤارە بێنابڕووەکان و وێنەی ئافرەتە بەرەلاکان روونەکەنە مالەکانمان، وە رۆلەکانمان لە زیانیان شارەزا بکەین و، تێیان بگەیەنین کە چ پیلانێکی گلاو لە ئارادایە بۆ ئەوەی بێ رەوشت بێت.

•دەبێت لە مەسەلەی قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ لە دلی لاوەکانماندا وەکو حەقیقەتێکی نزیک باس بکەین، وە تامەزرۆی بەهەشت و نازو نیعمەتە نەبڕاوەکانیان بکەین، وە لە سزای بەئێش و ئازارو نەبڕاوەی دۆزەخ بیانترسێنین، تا بەهەشت بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن. دەبێت بەردەوام لەهەولی کوژانەوەی ئاگری جنسیدا بین تا بە ئاگری دۆزەخ نەسوتێین.. ئەویش بە پەیڕەوی کردنی ئەم خالانەی خوارەوە

(١) دوورەپەرێزی لەو شوێنانەی کە ئافرەتی خراپەکاری تیایەو، بێهودەو بێکار بەناو بازاڕدا مەسوڕێنەوە.

(٢) خۆبەدوورگرتن لە تەماشاکردنی بەرنامەو وێنە بەدڕەوشتەکان .

(٣) رەچاوکردنی مۆلەت وەرگرتن و لەدەرگادان لەکاتی سەردانی خزم و خوێشان و چوون بۆ دام و دەزگاکان.

(٤) دوورەپەرێزی لە شوێن و کۆڕی گەمەو گالتە، وە لە بینینی فلیم و شانۆگەرییەک کە ئارەزوو بزوێن بێت.

## سێهەم : هاوەلی چاک :

ئاشکرایە کە هاوەلی چاک زۆر کاریگەرە لەسەر ئادەمیزاد، هەروەکو لەفەرموودەیەکدا هاتووە : ( المرء على دين خليله، فلينظر أحدكم من يخالل)، صححه الألباني في صحيحه، رقم الحديث/٩٢٧.

واتە: ئادەمیزاد لەسەر ئایین و بیروباوەڕی هاوەلەکەیەتی، جا هەریەکەتان سەرنج بدات بزانێت هاوەلیی کێدەکات، جا ئەگەر کەسانی چاک و پاک و رەوشت بەرزمان کرد بە هاوەلی خۆمان، ئەوا بێگومان سەربەرزو سەورفرازی دنیاو قیامەت دەبین، و بە پێچەوانەوە، ئەگەر کەسانی ناپوخت و بەدڕەوشت و ناباشمان کردە هاوەلمان، ئەوا خۆمان بەدەستی خۆمان ریسواو خەجالەت و شەرمەزاری دنیاو ئاخیرەت دەکەین، دەبێت کەسانێک بکەینە هاوەل و هاوڕێی خۆمان کاتێک کە چاکەیەک فەرامۆش دەکەین بیرمان بخاتەوە، وە کاتێک غافل دەبین بێدارمان بکاتەوە، وە ئەگەر هەلەیەکمان لەدەست قەوما نائومێدو بێهیوا تەرەمان نەکات، ئەوانەی کە کۆڕو دانیشتنەکانیان بە فریشتە دەوردەدرێ، زمانیان پاراوە بە یادی خوا، دلیان روون و ئاوەدانە بە نووری ئیمان، بەدانیشتن لەلایان زانستیو زانیاری زیاد دەکات، وە بەتێکەلییان رەوشت بەرزیو بەنزیکییان ئارامییو سەرفرازی دەست دەکەوێت.

ئەوانەی قورئان دەربارەیان دەفەرموێت :

﴿الأخلاء يومئذ بعضهم لبعض عدو إلا المتقين﴾ واتە: دۆستان و برادەران لەو رۆژەدا واتە لە رۆژی قیامەتدا هەموویان دوژمنی یەکترن، جگە لەوانەی کە لەخوا دەترسان و پارێزکاربوون .

حەزرەتی عیسا ﷺ فەرموویەتی: ( جالسوا من تذکرکم بالله رؤیته، ومن یزید في عملکم کلامه، ومن یرغبکم في الآخرة عمله) واتە: هاوەڵی کەسێك بکەن و لەگەڵ کەسێکدا دانیشن کە هەر بە بینینی خوای گەورەتان بیەوە یاد، وە هەر کە قسەی کرد گوفتاری ببێتە هۆی هاندانتان بۆ زیاتر ئەنجامدانی کارو کردەوەی چاك، هەروەها هەڵس و کەوت و کارو کردەوەی ببێـە هـۆی ئەوەی کە هاندەرتان بێت بۆ بەدەست هێنانی رەزامەندی خواو بەهەشت لە قیامەتدا.

جا ئەو جۆرە کەسانە لە ئەڵماس و گەوهەری ناو کۆمەڵن و حەق وایە هەموو کەس بەتایبەت لاوەکانمان بە شوێنیانا بگەڕێن و ئەگەر رێیان لێکەوت لەدەستیان نەدەن و سوودیان لێوەرگرن .

حەزرەتی عومەریش -رەزای خوای لەسەربێ- هانی داوین بۆ هاوەڵێتی ئەو جۆرە کەسانەو فەرموویەتی:

( پێویستە راستان و پاکان بکەیتە هاوەڵت و لەگەڵیانا بژیت، چونکە ئەوانە زینەتن لە خۆشیداو یارمەتیدەرن لە ناخۆشیدا )...

## چوارەم : سوود وەرگرتن لە کاتی بێکاری :

ابن الجوزی لە کتێبی (صید الخاطر)دا دەڵێت :

پێویستە ئادەمیزاد نرخی کاتی بزانێ‌و هەوڵ بدات، تەنانەت تاوێکی بەفیڕۆ نەدات، وە هەمیشە کارە چاکترو گرنگەکان پێش ئەوانیتر ئەنجام بدا

هەروەها پێشەوای شەهید ( حسن البنا ) -رەحمەتی خوای لێبێت- نرخی کاتیی خستۆتە بەرچاوو وتوویەتی:

کات ژیانە وە هانی ئیمانداڕانی داوە بۆ ئەوەی کاتیان بەفیڕۆ نەدەن، وە فەرمانی بە خوێندن و موتاڵاکردن داوە، یا گوێگرتن و تێفکران، چونکە کات بەفیڕۆدان خێر لەدەست دانە، بەڵکو ئەگەر کاتەکانمان بە چاکەو خێر بەسەرنەبەین لەوانەیە بە گوناهو تاوان بەسەری ببەین..
هەروەها فەرموویەتی: ( الواجبات أکثر من الأوقات) .

مامۆستا (محمد قطب)یش لە کتێبی (منهج التربیة الإسلامیة)دا دەڵێت:

بێکاری هۆی لادانی نەفس و سەرکەشییەتی ، وە هۆیەکە لە هۆکانی وزە بەفیڕۆدان، وە یەکەم خراپەی بێکاری لەناوبردنی وزەیە بۆ پڕکردنەوەی بێکاری، لەوەودوا دەبێتە هۆی خووگرتن بەکاروکردەوەی زیان بەخشەوە

د. عبدالله ناصح علوان لە کتێبی (تربیة الأولاد)دا دەڵێت:

کاتێ لاو بەتەنها بێکارە، خەتەرەو خەیاڵی جینسی هێرشی بۆ دێنن و شەیتانیش هانی دەدات بۆ کاری نادروست و خووی ناپەسەند تا ئارەزووی خۆی بشکێنێ.. جا ئەگەر ئەو لاوە بیروهۆش و لاشەی بە کارێکی بەسوودەوە خەریك بکات ، ئەو جۆرە خەتەرەو خەیاڵانە رووی تێناکەن .

مامۆستا محمد قطب دەڵێت:

کاتێ ئیسلام بەرهەڵستی داب و نەریتێ‌و بۆنەو بەرنامە نەفامیەکان وەستاو لە دڵ و دەروون و بۆچوون و ژیانی خەڵکی دووری خستەوە.. شوێنی ئەو شتانەی بە بۆشیێ‌و خاڵیێ‌و بەتاڵ

نەهێشتەوە. بەڵکو جەژنی ڕەوای خستە جێگەی جەژنە نارەواکانیان .. داب و نەریتی جوانی خستەجێی داب و نەریتی ناشیرینیان .. بەرنامەی ژیانی پڕ لە دادو خۆشەویستی خستە جێی بەرنامەی پڕ لە ستەمیان .. هونەری نارەسەن و نارەزووبزوێنی هەڵپیاو هونەری پاک و بێگەردی خستە جێگەیان، شیعرو هۆنراوەی خۆفش کردنەوەو خۆبەزل گرتن و خۆهەڵکێشانی کردە شیعرو هۆنراوەی پڕ لە سۆزو خۆشەویستی بۆ خواو بۆ بەندەکانی خوا..

## ئەو کارو شتە چاکانەی کە ئیماندار دەبێ کاتی خۆی پێ بەرێتە سەر:

(١) ئەنجامدانی نوێژی پێنج فەرزە بە جەماعەت لە مزگەوتا.. حوسەینی کوڕی عەلی دەفەرموێت: ئەوەی بەزۆری هات و چۆی مزگەوت بکات گەلێ سوود بەدەست دەهێنێت، لەوانە: زانستی بەکەڵک فێردەبێت، ڕەحمەت و میهرەبانی چاوەڕێی دەکات، گوفتارێک دەبیستێ کە یا ڕێگەی هیدایەتی نیشان دەدات، یا لە گومڕایی دەیپارێزێ. دوورەپەرێزی دەگرێ لە گوناە، یا لەبەر شەرمەزاری خەڵک یا لەترسی خوا.

(٢) ئەنجامدانی وەرزش بەتەنها یا بەکۆمەڵ و بەشداربوون لە یانە وەرزشییەکانداو خۆخەریک کردن بەوەرزشێکەوە کە لاشە بەهێز بکات: چونکە (المؤمن القوي خير وأحب إلى الله من المؤمن الضعيف، وفي كل خير). واتە: ئیمانداری بەهێز چاکترەو خۆشەویسترە لای خوا لە ئیمانداری لاواز، لەهەردوولادا خێر هەیە

(٣) بەشداری کردنی کۆڕو وانەو دەرسە ئیسلامیەکان .

(٤) موتالای کتێبی ئیسلامییوز زانستیو کۆمەلایەتی و سیاسی.

(٥) بەشداری چالاکییە ئیسلامیەکان .

(٦) سەیران و سەفەرکردن لەگەڵ ئیماندارانی پابەند بە ئیسلامەوە .

(٧) خۆفێرکردنی پیشەیەکی بەسوود

(٨) سەردانی خزمان و خوێشان و دراوسێکان .

(٩) بەشداریکردنی کاری خێرخوازی بە ماڵ و سامان ئەگەر هەبوو ، وە بە هەوڵ و تێکۆشانی جەستە ئەگەر ماڵ و سامان نەبوو، یان هیچ نەبێت هەست و شعوور.

(١٠) لەهەمووی گرنگتر پێویستە کاروباری ڕۆژانەمان بە گوێرەی خشتەیەکی تایبەت بێ هەمووی پڕ بکەینەوە بە کاری خێرو بەسوود

دەبا ئەوەمان کە خوای میهرەبان لەشەڕی نەفسی پاراستوویەتی با سوپاس گوزار بێت.. وە ئەوەشمان لەسەردەمێکی غەفلەت و بێئاگاییدا تووشی هەڵەیەک بووە، با نائومێد نەبێت، چونکە (كل بني آدم خطاء وخير الخطائين التوابون) واتە: هەموو ئەوەی ئادەم گوناهبارو گوناهکارن، وە چاکترین گوناهباران تەوبەکارانن. با پڕ بە دڵ لە زاتی بەدیهێنەرمان بپاڕێینەوە کە لەشەڕی نەفس بمانپارێزێ وە ئیمان و باوەڕ بڕازێنێتەوە لە دڵ و دەروونماندا وە کوفرو گوناهو یاخیبوون لەبەرچاومان بخات، وە ئەوەندە ترسی بخاتە دڵمانەوە کە دوورەپەرێزی بکەین لە زوڵم و ستەم و گوناە بەهەموو شێوەکانیەوە . وە بەڕەحمەتی خۆی بەبەهەشتی بەرینمان شاد بکات . آمين

# نەفس و بەشەکانی

**سەرەتایەک :**

مرۆڤ دروستکراوێکی سەرسوڕهێنەرەو، سورشتێکی ئاڵۆزو، توانایەکی جۆراوجۆری‌هەیە، زۆر بەئاسانی دەتوانێت چاکەو خراپە لەیەکدی جیابکاتەوەو ئەو کاتەش دەتوانێت بەرەو چاکە یان خراپە بڕوات، ئەم تواناو وزەیەش لە دەروونی مرۆڤدا هەیەو هەمووکات ئامادەیە

مەبەستیش لە پەیامی پێغەمبەران بزواندنی ئەو تواناو هەستانەیە نەک دروست کردنیان، چونکە لەبنەڕەتدا هەن.

لەگەڵ ئەوانەشدا لە دەروونی مرۆڤدا هێزێک هەیە، ئەو کەسەی ئەو هێزە بە پاک رابگرێت ئەوا سەربەرز دەبێت، وە بەپێچەوانەوە ئەگەر ئەو هێزە پۆخڵ بکرێت ئەوا خاوەنەکەی زەرەرمەندە، ئەو هێزەش نەفسە

زانای بەناوبانگ (ابن القيم) دەڵێت: نەفس دەورێکی سامناکی هەیە لە ژیانی ئیمانداردا وە ئیماندار دەزانێت کە هەموو ئەخۆشیە دەروونی‌یەکان بەهۆی نەفسی بەدکارەوە پەیدا دەبن، چونکە کاتێ ژەنگ دێنێت کاردەکاتە سەر هەموو ئەندامەکان کە لە پێش هەموویانەوە دڵە.

جا نەفس حەز بە لادان و سەرکەشی و دنیاپەرستی دەکات، خوای‌گەورەش بانگەوازدەکات بۆ بەهەشت و لێخۆشبوون و هەوڵدان بۆ زاڵ بوون بەسەر نەفس دا دڵیش لەو ئێوانەدایە.. ( فأما من طغى وآثر الحياة الدنيا فإن الجحيم هي المأوى وأما من خاف مقام ربه ونهى النفس عن الهوى فإن الجنة هي المأوى) النازعات/٣٧-٤١.

واتە: ئەوەی سەرکەشی دەکات و مەبەستی تەنها ژیانی دنیایەو ئەوی زیاتر مەبەستە ئەوە دۆزەخ جێگەو رێگەیەتی.. بەڵام ئەوەی کە لە وەستان و هەڵوێست و رووبەڕووبونەوەی پەروەردگار دەترسێ، وە جڵەوی نەفسی دەگرێت لە لادان و یاخی‌بوون .. ئەوە بەهەشت جێگەو مەنزڵگایەتی. پێغەمبەریش ﷺ زۆرجار وتاری بەم دەقە پیرۆزە دەست پێ‌کردووە: (إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا) واتە: بەڕاستی سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە.. ئێمەش سوپاسی دەکەین و داوای کۆمەکیی لێدەکەین و داوای لێخۆشبوونی لێ دەکەین پەنا دەگرین بە خوا لە شەڕو خراپەی نەفسمان وە لە کردەوە خراپەکانمان، هەروەها لە شوانیدا ئەو دوعایەی فەرمووە: ( ربِّ آت نفسي تقواها وزكّها أنت خير من زكّاها أنت وليها ومولاها) .

واتە: پەروەردگار تەقوا ببەخشە بە دڵ و دەروونم و خاوێنی بکەرەوە چونکە تۆ چاکترین زاتێکی کە بتوانی پاک و خاوێنی بکەی، وە هەرتۆ پشتیوان و یاریدەدەرێتی. جا ئاشکرایە کە خواوەندی دانا ئامادەیی لەنەفس دا دابین کردووە بۆ ئەوەی بتوانێ پاک و خاوێن بێت، یا پۆخڵ و تاریک و ژەنگاوی بێت.. بەڵام مژدە دەدات بەوانەی کە نەفسیان پاک و پوختە دەکەن کە سەرفرازو سەرکەوتوون، وە سەرەنجامی دەروون ناپوختەکانیش دەخاتە روو کە پەشیمان و نائومێدو خەجاڵەتن: ﴿ ونفس وما سوّاها فألهمها فجورها وتقواها قد أفلح من زكاها وقد خاب من

دساها﴾ جا نەفس جارجار ئاسودەیە کە بەدەم بانگەوازی خواوە دەچێت .. زۆرجاریش تەنگ و غەمبارە کاتێک کە بەدەم بانگەوازی نەفس و شەیتانەوە دەچێت.

جا قورئان ئاماژە بۆ سێ جۆر نەفس دەکات :

١- نەفسی امارة ٢- نەفسی لوامة ٣- نەفسی مطمئنة.

١ - **نەفسی أمارة** : واتە ئەو نەفسەی کە فەرمان بە خراپەو تاوان و گوناه دەدات، ئەمجۆرە نەفسە سواری سەری خاوەنەکەی بووەو ئارامی لێ هەڵگرتووەو بەرچاوی تاریک کردووە، کەم ئامۆژگاری دەبیستێ، کەم گوێ بۆ حەق دەگرێت، ئەگەر بەزەیی خوا نەبێت کەم جار ئەم جۆرە کسانە بەرەو ئیمان دێن، بەڵام بەهۆی رووداوێکی دڵتەزێنەوە هەندێجار دادەچڵەکێت، لە باسی ئەم جۆرە نەفسە قورئان لەسەر زمانی (زلیخا)وە دەفەرموێ: (وما أبرىء نفسي إن النفس لأمارة بالسوء) یوسف/٥٣.

٢- **نەفسی لوامة**: قۆناغێکە لە قۆناغەکانی گۆڕان لە ئەفس دا ، کە زۆربەی ئیمانداران دەگرێتەوە.. ئەویش بەوەی کە کاتێک گوناهێک دەکەن، پەشیمان دەبنەوەو لۆمەی خۆیان دەکەن، یاخود بەردەوام پەشیمانن لە رابووردووی خۆیان وە خوایگەورە ئەم جۆرە نەفسەی لا پەسەندە و سوێندی پێ خواردووە، جا هەتا ئێمە خاوەنی دڵ و دەروون و نەفسێکی وا بین ئەوە مانای وایە ئیمان و باوەڕمان سەلامەتە.

٣- **نەفسی مطمئنة**

واتە : ئارام و دامەزراو .

بێگومان ئەو کسانە دەبنە خاوەنی ئەو نەفسە کە بەردەوام لە زیکرو یادی خوا غافڵ نابن، ئەوانەی کە زۆر مەبەستیانە رەزامەندی خوا بەدەست بێنن جڵەوی نەفسی خۆیان گرتووەو ناهەڵن سەرکەشی بکات، ئەو بەختەوەرانە لەسەرەمەرگدا پێیان دەوترێت: (يأيتها النفس المطمئنة ارجعي إلى ربك راضية مرضية فادخلي في عبادي وادخلي جنتي) الفجر/٢٧-٣٠

واتە: ئەی خاوەن نەفسی دامەزراوو دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت ئەو لە تۆ رازییەو تۆش لەو رازیت.. بچۆرە ریزی چاکەکانمەوە، بچۆرە ریزی بەهەشتەکەمەوە.

خۆزگە ئەم مژدە قورئانییە لەسەرەمەرگ و کۆتایی ژیانمان شایستەی دەبوێت و روو بە هەمووانمان دەوترا.

## کاریگەری گوناهو تاوان

گوناهو تاوان شوێنەواری خۆی بەجێ دێڵێ بەسەر گوناهبارەوە لە دنیا و لە قیامەتیش دا ئەگەر تەوبەی راستەقینە نەکات وای لێ دێت کە :

١- کەڵک لەو زانیاریو زانستیانە وەرناگرێت کە بەهۆیەوە لە خوا نزیکی دەکاتەوە چونکە ئەوجۆرە زانستانە نوورن و نابەخشرێن بەو کسانەی کە سوورن لەسەر گوناهو تاوان .

٢- بێبەرەکەتی لە رزق و رۆزیو تەمەندا.

٣- هەمیشە دڵتەنگ و غەمبارە هەتا وای لێ دێت بۆ ئەوەی بەخەیاڵی خۆی تۆزێ غەمی کەم کاتەوە پەلاماری گوناهی تر دەدات وەکو عەرەق خواردنەوەو خواردنی مادده

بێهۆشکەرەکان.

٤- نەحەوانەوەو هەست نەکردن بە نازونیعمەتەکان.

٥-مرۆڤی ئیماندار کاتێ گوناهێک دەکات کارکردنی دەبینێ لەسەر ژن و منداڵ و شتەکانی تریش.. هەروەک پیاوچاکێک دەڵێت: جاری وا هەبووە هەڵەیەک یا گوناهێکم لەدەست دەرچووە کەچی زووبەزوو کارکردیم بینیوە لە هەڵس و کەوتی خێزانەکەم و ئەسپەکەم دا.

٦- کارەکانی بە قورس و گران دێ بەدەستەوەو زۆرجار هەست دەکات کە دەروازەکان لە روویان دا داخراوە.

٧- ئەگەر زوو فریای خۆی نەکەوێت گوناهـ ، گوناهی تر دێنێت و دەبێتە هۆی رەش بوونەوەی دڵ و مردنی.

٨- لاوازیی رووددەکاتە دڵ و دەروونی و لەبەرانبەر گوناهەوە خۆی پێناگیرێ و دڵی دەمرێ ئەوکاتە گوێ بە حەرام نادات.

٩- وای لێ دێت کە گوناه بە ناشیرین نازانێت، لەوانەیە بەشانازییەوە لای هاوەڵەکانی باسی گوناهو تاوانەکانی خۆی بکات.

عبداللەی کوڕی عەباس فەرموویەتی:

چاکەکاری رووخسار رووناک دەکاتەوە، نوور دەخاتە دڵەوە، بەرەکەت دەخاتە رزقەوە، هێز بە لاشە دەبەخشێت و خۆشەویستی بەخەڵک پێشکەش دەکات، گوناهیش رووزەردی و خەجاڵەتی لەدوایە، دڵ تاریک دەکات لاشە لاواز دەکات، بەرەکەت لە رزق و رۆزیدا ناهێڵێت، خۆشەویستی خەڵکی لەناودەبات، رق و کینەیان دەبزوێنێ..

بەتایبەت ئەگەر گوناهەکە دەست درێژی بێت بۆ سەر ماڵ یان ناموسی کەسانیتر، جا هەرکەسێ بەردەوام بێ لەسەر گوناهو تاوان بەرەبەرە حەیای لێ هەڵدەگیرێ و شەرم و شکۆی نامێنێ، هەتا وای لێ دێت شانازی پێوە دەکات و خۆی پێوە هەڵدەکێشێ، چونکە عەقڵ و ژیری خۆی لەدەست داداو دیەوێ هاورێ بۆ خۆی زۆر بکات.. جا ئەوەی شەرم لە خوا بکا، خوایگەورەش شەرمی لێ دەکات بەڵام ئەوەی شەرمی لێ نەکات لە رۆژی قیامەتدا لەبەرچاوی هەموو ئەو خەڵکە حەیای دەبات.

ئەوەی لەدنیادا حساب بۆ گەورەیی خوا نەکات و بێشەرمانە هەرچی نەفسی بەدکاری داوای لێکرد بیکات، لە قیامەت دا خوای گەورە پشت گوێی دەخات و فەرامۆشی دەکات.

پیاوچاکێک دەفەرموێت: کاتێک کە دەتەوێ گوناهێک بکەیت با بچوکیش بێت سەیری گوناهەکە مەکە، بەڵکو بزانە تۆ سەرپێچی کێ دەکەیت و لەکێ یاخیدەبیت.. ئەگەر ئیماندار بەو شێوەیە بیربکاتەوە گوناهو تاوان لە کۆمەڵگاکەماندا بنەبڕ دەبێت و متمانەو باوەڕ بەیەک و خۆشیو شادی و کامەرانی هەردوو دنیا بەدەست دێنین.

## لە شێوەکانی بەریەرەکانی نەفس

هەرکەسێ دەیەوێت چارەسەری نەفس و دەروونی خۆی بکات.. با سەرەتا دەست بکات بە لۆمەکردن و گلەییکردن لە خۆی، ئەوجا ئامۆژگاریو لێپرسینەوە، دوایی ترساندن لە سزای تونلوتیژی خوایـو خەجالەتباری رۆژی رەستاخێز، هەروەها بەردەوام فرمێسکی پەشیمانی هەڵوەرێنێ بۆ شتنەوەی چڵک و ژەنگی گوناهانی رابردووی و دەبێ بزانێ هۆکارەکانی چین، ئەگەر هاوەڵە بێدین و خوانەناسەکانییەتی، با هەوڵ بدات ئەوان (اصلاح) بکات، با هاوەڵی

چاك بۆ خۆی پەیدابكات، هەوڵ بدات سوود لە بەرنامە بەسوودەكانی كەناڵەكانی تەلەفزیۆن وەرگرێ، جار جارە بەڕۆژووبێ چونكە هەروەك پێغەمبەری سەردار ئامۆژگاری لاوانی كردووە و فەرموویەتی: ( ئەی كۆمەڵی لاوان ئەوەی دەتوانێ‌و بۆی دەلوێ هاوسەر بگرێ، با ژن بێنێ، وە ئەوەی ناتوانێ با بەڕۆژووبێت چونكە ڕۆژووگرتن چارەسەرەو خۆگرییەو خۆ دوورخستنەوەیە لە گوناه).

بەم شێوەیە دەتوانین نەفسمان بگرینەوەو ڕایبێنین لەسەر دوورەپەرێزی لە زۆربەی گوناهەكان.. ڕاستە خۆ هەرچی بكەین نابینە فریشتە، بەڵام بەئەنجامدانی ئەم كارانە بەلایەنی كەمەوە خۆمان دوورەپەرێز دەگرین لە گوناهە گەورەكان.

ئەوسا ئیتر لەباتی غەفڵەت بێداری، وە لە جیاتی هەڵەشەیی هێمنی، لە جیاتی قسەی بێتام و بێز قسەی بەجێ‌و پەسەند دەكەین، لە جیاتی تەماشای گۆڤارو كتێبی بێسوود تەماشای بەسوودەكانیان دەكەین، خۆمان بە دەوركردنەوەی قورئان و تێبینیكردنی واتاكانیەوە سەرگەرم دەكەین، قسەمان كەم دەبێ‌و بێدەنگیمان زۆر دەبێت.. بەمەش دڵمان ڕووناك دەبێتەوە بە نووری ئیمان.. نەك تەنها فەرزەكان بەجوانی و ڕێك و پێكی‌و جوان جێبەجێ دێنیین، بەڵكو سوننەتەكانیش ئەنجام دەدەین، پێشبڕكێ دەكەین بۆ ئەنجامدانی هەموو چاكەیەك.. وە هەموو ڕێیەك دەگرینەبەر بۆ دامركاندنەوەی نەفسی بەدكارو جڵەوگرتنی هەڵپەو تەماعە ناڕەواكانی. تا ئەو كاتە ئیتر سوودی لێوەردەگرین دەتوانین لە سنووری شەرعدا ڕایگرین، ئەوكاتە لە شەڕو زیانەكانی دنیاو قیامەتیش بەدووربین.

حەزرەتی یوسف نموونەی لاوێكی تا بڵێی قۆزو پێكەوتووبوو. وە قورئان ئاماژە دەكات بۆ ئەو ڕواڵەتە قەشەنگەی كە پەروەردگار پێی بەخشیبوو كاتێك كە لە كۆشكی پاشای میسر دەبێت زلێخا شێت و شەیدای دەبێت.. بەڵام ئەم هەر خۆی دەگرێت، تا ڕۆژێك بەفێڵ بانگی دەكات و هەموو دەرگاكان دادەخات و دەیەوێ حەزرەتی یوسف تووشی گوناهو تاوان بكات، ئەویش سەرەتا زۆر ئامۆژگاری دەكات.. بەڵام بێسوودە، سەرەنجام حەزرەتی یوسف ڕادەكات بەرەو دەرگاو دەیكاتەوە، ئا لەو كاتەدا ڕووبەڕوو دەبێت لەگەڵ مێردەكەی زلێخاو یەكێ لە خزمانیا.. زلێخا بۆ ئەوەی پاكانە بۆ خۆی بكات دەستی تۆمەت بۆ حەزرەتی یوسف ڕادەكێشێت، كە گوایە ئەو هاتۆتە سەری، دەبێت بەند بكرێت یان سزا بدرێت.

حەزرەتی یوسفیش دەفەرموێ: نەبەخوا، وا نیە، ئەو ویستی من لەخشتە بەرێ‌و عەیبدارم بكات، ئەو ویستی شەرمەزاری لای خواو عەبدی خوام بكات، كراسەكەشمی دڕاندووە ئەوسا خزمەكەی هەڵیدایەو وتی: من دەڵێم: ئەگەر كراسەكەی لەپێشەوە دڕابوو ئەوە زلێخا ڕاست دەكات، وە ئەگەر لە پشتەوە دڕابوو یوسف ڕاست دەكات.

كاتێك سەرنجیان دا كراسی یوسف لە پشتەوە دڕاوە، مێردەكەی وتی: ئەمە پیلان و پەنی ئێوەی ژنانە، یوسف تۆ ئەم ڕووداوە باس مەكەو زلێخا تۆش داوای لێخۆشبوون بكە چونكە بەڕاستی هەڵەو غەڵەتی تۆیە، جا ئەی لاوی بەڕێز: ئەگەر خوانەخواستە حەزرەتی یوسف ئەو هەڵەیەی بكردایە ئیتر حەزرەتی یوسف نەدەبوو، لەولاشەوە مێردی زلێخاو خزمەكەی بەمەیان دەزانی‌و بۆ هەمیشە حەیای دەچوو.كەچی ئەم هەڵوێستە پیرۆزەی لەقورئاندا بۆ هەتا هەتایی دەمێنێتەوە، بەڵكو لە تەورات و ئینجیلیش دا باس كراوە.

لە كۆتاییدا دەڵێین خوایەگیان بەڕەحمی خۆت لەشەڕی نەفسی (امارة) بمانپارێزی‌و عاقیبەتمان بەخێر كۆتایی پێ بێنی آمین .

# حه قیقه تی یادی خواو
# ذیکره سه ره کیه کان

**بەرنامەی خوایی بۆ پەروەردەکردنی ئادەمیزاد**

بەرلە هەموو شتێک ئاماژە بۆ ئەوە دەکەین کە دەروونی ئادەمیزاد خاوەنی تایبەتمەندییەکە، ئەویش بریتییە لەوەی کە ئەگەر شتێک زۆر دووبارە بکاتەوە دەبێت بە خەسڵەت و رەوشتی هەمیشەیی بۆی ، بۆ نموونە: لەناخی مرۆڤدا ئەو ئامادەییە هەیە کە ترسنۆک دەرچێت مرۆڤ لەسەرەتاوە حاڵەتێکی ترسی کاتیی بەسەردا دێت، ئەگەر زەمینەو هۆکارەکانی نەما حاڵەتەکەش نامێنێت. بەڵام ئەگەر بۆ چەند جارێک دووبارە بووەوە دەبینین هەر جارە ئاسەوارێک -با کەمیش بێت- لەسەر دەروونی ئەو کەسە بەجێ دێڵێ، بازنەی ئاسەوارەکە لەگەڵ دووبارەبوونەوەدا فراوانتر دەبێت و ، ئەو کاتە ترسنۆکی دەبێت بە رەوشت و حەسڵەتی تەواوی هەمیشەیی لەدەروونیدا.

دەروونی ئادەمیزاد پێک دێت لە (رۆح) لەگەڵ ئەو تایبەتمەندیانەی کە لەدوای دووبارەبوونەوەی زۆرو بەردەوامەوە تیایدا دەبنە خەسڵەتێکی ریشە داکوتراوی هەمیشەیی.

لەسەر بناغەی ئەو راستییەی سەرەوە دەبینین، بەرنامەی خوایی بۆ پەروەردەکردنی موسڵمان ئەمەی تێدا رەچاو کراوە، جا بۆ ئەوەی ئەو خەسڵەت و رەوشتە چاکانەی کە خوا پێی خۆشن و لێیان رازییە لەناخی مرۆڤدا ریشە داکوتن و ببن بە شتێکی هەمیشەیی، کراوە بە ئەرک بەسەر موسڵمانەوە کە ئەو پەرستش و یادانە بەردەوام دووبارە بکاتەوە، ئەو کاتە دەروونی ئادەمیزاد بریتی دەبێت لە رۆح لەگەڵ ئەو خەسڵەت و رەوشتە جوانانەی کە بەگوێرەی ئەو بەرنامە خواییە لە ناخ و کەسایەتی مرۆڤدا گەشەیان کردووەو ریشەیان داکوتاوە. دەکرێ نموونە بە نوێژ بهێنینەوە.

دەبینین نوێژ کە گەورەترین کاری چاکەی نیماندرانە، چەندێک دووبارە دەبێتەوە؟ نەک لەتەمەندا بەڵکو لە رۆژێکدا نەک رۆژی یەک جار بەڵکو چەند جار، تەنانەت یەک نوێژ رکاتەکانی دووجارو سێجارو چوارجار دووبارە دەبێتەوە، هەندێ لە ویردو یادەکانی لەیەک رکاتدا چەند جار دووبارە دەکرێنەوە.

ئەوەی لە نوێژکردندامەبەستە بێتەجێ ئەوەیە کە: دەبێ ماناو چەمکەکانی نوێژ - ئەو رەوشت و خەسڵەتانەی کەبەشەکانی نوێژ داخوازیی دەکەن- ببن بە حاڵەت وخەسڵەتی ریشە داکوتاو لەناخی مرۆڤدا، بەجۆرێک کە رۆحی ئەو مرۆڤە بەوانەوە بناسرێت و سەرەنجام ئەومرۆڤە ببێتە کەسایەتییەک کەلە گرنگرین رەوشتەبەرزەکانی ئەو حاڵەتانە کە لە نوێژو تاکامی نوێژدا پەیدادەبن.

جگە لەمە شتێکی روونە کە مرۆڤ بۆ پەرستن و گوێڕایەڵی دروست کراوە، بەو مانایە کە گوێڕایەڵی خوای گەورەبکات، بۆ ئەوەی سود لە نموونەکانی رەحمەت و سۆزی خوای میهرەبان وەرگرێت بۆ گەشەدان بە دەروونیو راستکردنەوەی لە ژیانی دنیادا. وەلەبەر ئەوەی کە (عبادة) واتاکەی گوێڕایەڵی خوای گەورەیە لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، پێویستە پێش هەموو شتێک

یادی خوا بێتە دی بۆ ئەوەی پەرستش و گوێڕایەڵی‌یەکە بە دڵسۆزی‌یەوە ئەنجام بدرێت واتە: تەنها لەبەر خاتری خوای گەورەبێت، چونکە دڵسۆزی بەشێکی گرنگ و بنەڕەتی‌یە لە پەرستش وگوێڕایەڵی خوادا.

مرۆڤی موسڵمان بۆ ئەوەی لەسەرجەم بوارەکانی ژیانیدا بە گوێرەی بەرنامەی خوا هەڵس و کەوت بکات وخواش لێی قبوڵ بکات، پێویستە پەیوەندی بە خوای خۆیەوە هەبێت، چونکە ئەگەر بێئاگاو غافڵ بوو لە خوا ئەوە ئەنجامدانی ئەو کارانە بە عیبادەت دانانرێت، چونکە بۆ قبوڵ بوونی عیبادەت دوو مەرج پێویستە:

یەکەم / دڵسۆزیی و بۆ خوا کردن

دووهەم / ئەنجامدانی بەرنامەکەی خوا بەدروستیو بەتەواوی

ئەگەرکەسێک لایەنێک لەبەرنامەی ئیسلام ئەنجام بدات، بەڵام دڵسۆزی بۆخوای تێدا فەرامۆش کرد، ئەو کارە بە عیبادەت دانانرێت. کەواتە لە ناوەندی هەرجۆرە پەرستش و گوێڕایەڵی‌یەکی خوای گەورەوە پێویستە یادی خوا بکرێت، تا لایەنی دڵسۆزیو بۆ خوایی تێدا بێتەجێ.

هەروەها لەبەرئەوەی کەیادکردنەوەی لاوەکیو کەم و کورت و سات سات و پچڕ پچڕ کاریگەر نی‌یە، پێویستە یادی خوا ریشەدارو بەردەوام بێت، بگرە ئەو یادە ئەبێ ببێتە خسڵەت و سیفەتی هەمیشەیی موسڵمان، بۆیە ئایینی ئیسلام یادی خوای کردووە بە ئەرک بەوسەر موسڵمانەوە، کە لەشەوو رۆژدا چەندەهاجار دووبارەی بکەنەوە.

## یادی خوا چی‌یە ؟

لەسەرەتای سوورەتی (أنفال)ەوە خوای گەورە روو بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (یسألونك عن الأنفال قل الأنفال لله والرسول فاتقوا الله وأصلحوا ذات بینکم وأطیعوا الله ورسوله إن کنتم مؤمنین)

واتە: پرسیارت لی‌دەکەن سەبارەت بە (انفال) (الأنفال واتە: ئەو کانزاو سامانە سروشتیانەی کەکەس خاوەنیان نی‌یە)، بڵێ ئەو سامانە بۆ خواو پێغەمبەرە ﷺ کەواتە با تەقواتان هەبێت ونێوانی خۆتان چاک کەن و گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، ئەگەر ئێوە ئیماندارن.

پێش هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە خەڵک سامانی سروشتیان بۆ خۆیان دەبرد بەڵام خوای گەورە لەم ئایەتەدا ئاگاداری کردن ئەو شتانەی دەیدۆزنەوە تایبەتن بە خواو پێغەمبەرەوە ﷺ واتە گشتین، ئینجا لەدوای ئەم ئایەتەوەیەکسەردەفەرموێت : (إنما المؤمنون الذین إذا ذکر الله وجلت قلوبهم وإذا تلیت علیهم آیاته زادتهم إیمانا وعلی ربهم یتوکلون) .

واتە: باوەڕداران ئەوانەن کە ئەگەر یادی خوا لەلایان بکرێت دڵیان ترسێکی ئیماندارانەی تێدەچێت و دەهەژێت، خۆ ئەگەر ئایەتەکانی خوایان بەسەردا بخوێنرێتەوە ئیمانیان زیاد دەکات و پشت بە خوا دەبەستن، لێرەدا دەبینین پەیوەندی‌یەکی راستەوخۆو پتەو هەیە لەنێوان یادی خواو جێبەجێکردنی بەرنامەکەیدا. بەمە بۆمان روون دەبێتەوە کاتێ دەڵێین ئیماندار دەبێ هەمیشە لەیادی خوادا بژی، مەبەست ئەوەیە لە کاتی جێبەجێکردنی بەرنامەکانی خوادا بەجۆرێک جێبەجێی بکات کە گوێڕایەڵی لەفەرمانەکانی خوادەکات.

کەواتە یادی خوا بریتی‌یە لەوەی موسڵمان هەمیشە ئامادەی بەجێهێنانی ئەرکەکانی بەندایەتی بێت لەهەموو بوارەکانی ژیانیدا. بۆیە یادی خوا کارێکی سەربەخۆو جیا نیە لە کرداری ئیماندار بەڵکو پێویستە سەرجەم کارەکان بەیادی خواوە بکرێت، وەک: نوێژکردن، بەخشین، کڕین و فرۆشتن، بەشداری کردن لە گۆڕەپانی جەنگدا، خۆڕاگری لەسەر ئەشکەنجەو ئازار، ئەنجامدانی هەموو ئەو ئەرکانەی کە خوا داوایان دەکات لە ئیماندار.

## نوێــژ :

لەبەرئەوەی کەیادی خوا وەک وتمان هەوێنی بەرنامەی خوایی‌یەو، نوێژیش هەمووی بریتی‌یە لە یادی خوا، خوای گەورە نوێژی لە سەرروو هەموو کارەکانی ترەوە داناوە، بۆ ئەوەی یادی خوا ببێت بەخەسڵەت وسیفەتی کەسایەتی ئیماندار.

نوێژو پەیوەستەکانی ، هەموونەو (أذکار)و یادە بنچینەیی‌یانەیان تیا کۆبووەتەوە کە پێویستن ببن بەرەوشت و ئاکار و خەسڵەت بۆ نەفسی ئیماندار، ئەوەتا دەبینین کە لە نوێژدا (کلمة الإخلاص) وتەی دڵسۆزی (لاإله إلا الله)و خوا بە تەواوەو بێعەیب ناسین (التسبیح)و سوپاسگوزرای (الحمد)و خوا لە هەموو کەس و لە هەمووشت بەگەورەتر ناسین (التکبیر)و داوای لێخۆشبوون (الإستغفار)و سلاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ هەموویان هەن. لەسەر ئەم بناغەیە ئەگەر ئیماندار نوێژی بەو ناوەڕۆک و واتایانە ئەنجامدا، ئەبێ کەسایەتی ئەو ئیماندارە لەو خەسڵەت و رەوشتانە پێک بێت کە ئاسەوارو سەرەنجامی ئەو یادو ویردانەی نوێژن.

## قۆناغەکانی یادی خوا :

سەرەتا پێویستە واتاو مەبەستی ذیکرەکە بزانرێت، پاشان لەدڵدا جێگیر بێت و، لە قۆناغێکی تردا ببێت بە حاڵەتێک بۆ ئەو کەسەو دوای ئەوەی کە زۆر دووبارە دەکرێتەوە دەبێت بە خەسڵەت و سیفەت بۆ دەروون و کەسایەتی ئیماندار، ئەگینا یادی سەرزارەکی رووت هیچ سوودێک بە خاوەنەکەی ناگەیەنێت، چونکە وتەکان چوارچێوەن و ئەوەی کە پێوستەو داواکراوە ئەوەیە لە دڵ و دەرووندا یادی خوا بێتەجێ.

## یادی تایبەتی‌و یادی گشتی :

هەندێک لە ذیکرەکان گشتین و لەهەموو کات و شوێنێکدا دەکرێ بخوێنرێت، وەک ئەمانە: (سبحان الله، الحمد لله، لاإله إلا الله، الله أکبر) ، هەندێکیشیان تایبەتن و بە کات و شوێنی دیاریکراوەوە، وەک کاتی باران بارین و چوونە مزگەوت و ...هتد. جا بۆ ئەم ذیکرانە پێویستە کات و جێگا بکیرێتە پێش چاو، هەروەها پێویستە حاڵی تایبەتی ئەو جۆرە پاڕانەوەو یادانە لەپێش چاو بگیرێت کە بۆ حاڵەتێکی تایبەتی دانراون، بۆ نموونە: ئەو پاڕانەوە قورئانیانەی کە بە (ربي)و (ربنا) دەست پێدەکەن، دەبێ بەو جۆرو حاڵەتەوە بخوێنرێت کە دەق و مانای ئایەتەکانی پێش و دوای پاڕانەوەکە دروستی دەکات و دەیخوازێت.

بەڕاستی پاڕانەوەو یادی خوا لە هۆکارە گرنگەکانە بۆ پەروەردەکردنی ئیماندار، ئەگەر بەچاکی‌ی ئەنجام بدرێت.

شتێکی هەڵەیە ئەگەر هەموکەس وەک یەک پێی بوترێ فلان پاڕانەوەو، فلان یادی خوای گەورە بخوێنە، بەبەهانەی ئەوەی کەپێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داوەو، ئەویش بۆ ئێمە سەرمەشقەو

کارەکانی سوننەتن. بەڵکو دەبێ هەرکەسەو چی بۆ باشەو پێویستێتی بۆ پەروەردەکردنیو پڕکردنەوەی کەم و کوڕییەکانی، ئەوەی بۆ دیاریبکرێت. بەڵگەو سەرمەشقمان بۆ ئەمە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆیەتی، بۆ نموونە: بە مەعاذی فەرموو کە لە کۆتایی هەموو نوێژێکەوە ئەم پاڕانەوەیە بخوێنێت کە دەفەرموێت: (أللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك) پێغەمبەر ﷺ ئەم یادەی لەسەر مینبەرو لەبەردەم هەموو موسڵمانانندا پێنەوتووەو بە هەموو موسڵمانانیشی رانەگەیاندووە کەبیخوێنن، بەڵکو تەنها بە مەعاذی فەرمووە، ئەویش کاتێ کە مەعاذ هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من تۆم زۆر خۆش دەوێت. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: منیش هەروەها تۆم زۆرخۆش دەوێت و وەسیێتت بۆ دەکەم دوای هەموو نوێژێک بڵێ: (أللهم أعني ..الخ) (بێگومان ئەم پاڕانەوەیە ئەمڕۆش بۆ زۆربەی موسڵمانان سوودی هەیەولەگەڵ حاڵیاندا دەگونجێت)، کەواتە پێویستە حاڵ و هەل و مەرجی هەرکەسە بگیرێتە پێش چاو بەرلەوەی هەر پاڕانەوەیەکی فێر بکرێت، بێگومان لەبەرئەوەی پێغەمبەر ﷺ لەلایەن خواوە فێردەکراو بە نووری خوا سەیری دەکرد، دادەنرێت بە گەورەترین زانا لە دەروون ناسیدا، بۆیە کە هەستی کردووە مەعاذ لەو سەردەمەی ژیانیدا لە پەرستش و یادی خوادا تەمەڵی دەکات و ئەرکەکانی بەتەواوی بەجێ ناهێنێت، پێی فەرمووە کەئەم پاڕانەوەیە بخوێنێت و لەدوای هەموو نوێژێکەوە دووبارەی بکاتەوە وەک دەرمانێک بۆ چارەسەری ئەو تەمەڵیو ساردیو لاوازییەی.

وەنەبێت ئەمجۆرە کارو وەسیێتانەی پێغەمبەر ﷺ شتێکی ناوازەو دەگمەن بووبێت، بەڵکو هەمیشە ئەمە شێوازی بووە لە چارەسەرکردنی لایەنە لاوازەکانی هاوەڵەکانیدا، بۆ نموونە کاتێک یەکێک لە هاوەڵەکانی پرسیاری لێکرد، کە باشترین و خێرترین کار چییە؟ فەرمووی: نوێژ لەکاتی خۆیدا، کە ئەگونجا بفەرموێت چاکترین کار کاری دڵە (یەکتاپەرستی) بەڵام دیارە ئەو هاوەڵە پێویستی بەوە بووە لە بواری گرنگیدان بەکاتی نوێژەکانیدا وریابکرێتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەیزانی چاکترین کار بۆ ئەو کەسە نوێژە لەکاتی خۆیدا، کەبەرادەی پێویست گرنگی پێنەداوە.

لە فەرموودەی تریشدا هاتووە کاتێک کە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کردووە، دەربارەی چاکترین کار شتێکی تری پێوتوون جگە لە نوێژ. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە چاکترین کار بۆ ئیماندار ئەوەیە شتێک بکات و بخوێنێت کەم و کوڕییەکانی بۆ پڕبکاتەوەو لە بوارەکانی بەندایەتیدا. کەواتە پێویستە حاڵ و تایبەتمەندییە دەروونیەکانی مرۆڤ رەچاو بکرێت کاتێک پاڕانەوەو یادی خوای فێردەکرێت.

بۆ نموونە: دەبینین موسڵمانێک خۆی هەڵدەکێشێت و شانازی دەکات بەوەوە کە فەرمانی کردووە بە چاکەو نەکردنی خراپە، نزیکە شەیتان لەبیری باتەوە کە ئەوەی ئەم کردوویەتی بەهۆی هێزو دەسەڵات و یارمەتی خواوە بووە، بۆیە پێویستە کە ئاگاداری بکەینەوە بەوەی کە یادی (لاحول ولا قوة إلا بالله) زۆر دووبارە بکاتەوە، دوای روونکردنەوەی تەواوی واتاو ناوەڕۆکی یادەکە، تا تێبگات کە هەموو هێزو توانایەک لە خواوەیەو تەنها خوا یارمەتیدەری مرۆڤە.

یەکێکیتر دەبینین کە دیمەنەکانی میهرەبانی خوای گەورە لە بوونەوەردا هیچ کاریان تێناکات، لەکاتێکدا کە چاوی خەڵکانی تری پڕکردووە لە سەرسامی، بەڵام ئەو چاوە دەخشێنێت

بەسەریاندا بەبێئەوەی بیریـان لێبکاتـەوە، تـابلۆ جوانـەکانی سروشـت و بوونـەوەر، وەک شـاخە گەردن کەشەکان و دەریاو شەپۆلەکانیو دەشتاییەیە سەوزەکان و گـەڵای شـەکاوەی دارستانەکان کاری تێناکەن، وەک ئەوەی هیچی نەبینیبێت، لەکاتیءکدا خەڵکیتر بەسەرسامییو تێڕامانـەوە دەڵێت: ( سبحان الله، سبحان الله، ماشاء الله) ( سبحان الله واتە: پاک و بێگەردیو تـەواوی بـۆ خـوای گەورە)، گومانی تێدا نییە ئەم ئەخۆشە پێویستی بە یـادی (تسبیح) هەیـە. ئـەو تەسـبیحەی کـە خەڵکی ئاسمانەکان و زەوی هەموو دەیڵێنەوە جگە لە مرۆڤی بێئاگای وەک ئەمەو هەندێک لـە ئێمە.. دەبێـت یادی بخەینەوەو پێی بڵێین: ئایا تۆ ئەم هەموو شتە نـابینیت؟ ئایا ئـەم هـەموو شتە بەڵگەی گەورەییو توانایی خوای گەورە نین؟ ئایا لەم کاتە ئاسکە پڕ سەرسامییەدا کە ئـەم هەموو دروستکراوانەی خوای پـەروەردگار دەبینیـت بـیر لـە خاوەنـە بەخشندەکەت ناکەیتـەوە؟ خۆزگە هەموو پەروەرشکارێک واتاو مەبەستی (تسبیح)ی بۆ قوتابیە ئەخۆشەکانی روون دەکـردەوە بە زبانی تایبەتی خۆی بەر لەوەی کە پێی بڵێت بەعەرەبی بیخوێنێت، بۆ ئـەوەی کـاتێ کـە بـە عەرەبی (زبانی قورئان) دەیخوێنێ بەتەواوی واتاو مەبەست و ناوەڕۆکی ئەو یـادە بـاڵ بکێشێت بەسەریداو کاری تێبکات.

ئەوەش بزانین کە لە قورئانتدا زۆر یادو پاڕانەوە دەستنیشـان کـراون و، حـاڵی مرۆڤـی تێـا رەچاو کراوە، بۆ نموونە: ئیمانداران لە کاتێکدا رووبەڕووی دوژمنانیان دەبنەوە پێویسـتیان بـەوە هەیە کە ترس روویان تێنەکات و دامەزراووو خۆگربن و، پێویستیان بە کۆمەک و یارمەتی خوای گەورە هەیە بەسەر کافراندا، بۆیە موسڵمانانی پێشین لـەو کاتانـەدا ئـەم پاڕانـەوەیان دەخوێنـد: (ربنا أفرغ علينا صبرا وثبت أقدامنا وانصرنا على القوم الكافرين).

ئەو جادوگەرانەی کە باوەڕیان بە مووسا پێغەمبەر ﷺ هێناو فیرعەون هەڕەشەی سزادان و کوشتنی لێکردن، پێویستیان بەوە هەبوو کە لەدەست فیرعەون رزگاریان ببێت و خـوا نـەیکا بـە تووشیانەوە بۆیە بەم جۆرە لە خوای گەورە پاڕانەوە: (ربنا لاتجعلنا فتنة للقوم الظالمين)

کەواتە زۆر پێویستە ئاگامان لەم خاڵە بێـت کـە لەڕاسـتیدا پایەیـەکی گرنگـی پـەروەردەی ئیسلامییە، دەبێ ئەگەر بانگخوازان تووشی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ستەمکاران یەکسەر هەمان دوعا بڵێنەوە.

یان لە کاتێکدا موسڵمان هەوڵ دەدات لەگەڵ منداڵەکانیدا بە باشترین شێوە نوێژ بخوێنـن، باشترین پاڕانـەوە بـۆ ئـەو موسـڵمانە پاڕانەوەکـەی بـاوکی پێغەمبـەران (ئیبراهیم)ە ﷺ کە فەرموویەتی: (رب اجعلني مقيم الصلاة ومن ذريتي) ، یا برایەک کە تازە پەیوەندی کردووە بە کاروانی ئیماندارانەوەو بەدەم بـانگی بـانگخوازانی رێگـای خـواوە هـاتووە واچاکـە ئـەم پاڕانـەوە ئـەمرە قورئانییەی فێربکرێت کە دەفەرموێت: (ربنا إننا سمعنا مناديا ينادي للإيمان أن آمنوا بربكـم فآمنـا ربنـا فاغفر لنا ذنوبنا وكفر عنا سيئاتنا وتوفنا مع الأبرار). یـان بـاوکێکی میهرەبـان کـە ئاواتـەخوازە ژن و منداڵەکانی ببن بە چاوڕۆشنکەرەوە بۆی و چاوی پێیان بگەشێتەوە بەوەی کە خوایگەورە بیانکات بە خواناس و پارێزکـار، دەیـەوێت بـە دارشـتنی خـۆی لـەخوا بپاڕێـتەوە خۆزگـە رێنموویی‌مـان بکردایە بۆ بەکارهێنانی هەموو هۆیەکی چاک و دروست لە بواری پەروەردەی ژن و منداڵەکانیداو پاش ئەوە فێرمان بکردایە کە ئەو پاڕانەوە قورئانییە بخوێنێت کـە تایبەتـە بـە حـاڵی یـەکێکی وەک ئەم باوکەوە، کە دەفەرموێت: (ربنا هب لنا من أزواجنا وذرياتنا قرة أعين واجعلنا للمتقين إماما)

هەروەها کاتێک بانگخوازێک دەیەوێت کارێک ئەنجام بدات پێویستە هۆکاری دروست بەکاربهێنێت لە کارەکەیداو جا لەگەڵ ئەوەدا ئەم پاڕانەوە دڵسۆزانەش بخوێنێت کە دەفەرموێت: (ربنا آتنا من لدنك رحمة وهيء لنا من أمرنا رشدا).

برای بانگخوازم! ئەمانە بکەرە نموونەو، بەم جۆرە بۆ هەموو کارو حاڵەتێک یادو پاڕانەوەی گونجاوو تایبەتی دیاری بکە.

کەواتە زۆر پێویستە ئاگاداری ئەم شێوازەو ئەم ئاراستە قورئانیانەبین لە یادو پاڕانەوەدا، کە پایەیەکی بنچینەیی پەروەردەی ئیسلامییە.

ئێستا با بێینە سەر باس و راڤەکردنی سێ (ذکر)ە سەرەکییەکە:

## داوای لێخۆشبوون (الإستغفار)

گومانی تێدا نییە کە مرۆڤ بەندەی خوایەو ئازو نیعمەتی زۆری بەسەردا رشتووە. مرۆڤ کاتێک دەبینێت کە نیعمەت و سپاردەکانی خوای گەورەی بەوجۆرە بەکار نەهێناوە کە خوا دەیەوێت لە بواری گەشەبەخۆدان (تزكية النفس)دا بەتەواوی سوودی لێوەرنەگرتووە. یا فەرمانێکی بەجێنەهێناوە، یاخود حەرامێکی ئەنجام داوە، ئەو کاتە داوا لەپەروەردگاری دەکات لێی خۆش بێت و شەرمەزارییەکانی بپۆشێت و دەڵێت: (أستغفرا لله) ، واتە: داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم، ئەمە یادێکی گشتییەو پێویستە هەموو ئیمانداران بەردەوام بیڵێنەوە، چونکە هەموو ئیماندارێک -پلەو پایەی ئیمانی هەرچەندێک بێت- بەشی خۆی کەمتەرخەمی هەیە لە بواری بەندایەتیدا. ئایا پێغەمبەر ﷺ نەگەیشتووەتە بەرزترین پلەو پایە؟ لەگەڵ ئەوەشدا دەفەرموێت: من لە رۆژێکدا حەفتاجار یاخود سەد جار داوای لێخۆشبوون لە خوایگەورە دەکەم، کەواتە پێویستە هەموو ئیماندارێک داوای لێخۆشبوون لەخوا بکات و لەهەموو شەوو رۆژێکدا چەند جار دووبارەی بکاتەوە، بەمەرجێک رەچاوی تێگەیشتنی تەواو لە واتای یادەکەو هۆی داواکردنەکەی بکات.

ئەگەر هەر بەندەیەکی خوا لە شەوورۆژدا حەفتاجار یاخود زیاتر، داوای لێخۆشبوونی لە خوایگەورە کردو، مەرجەکانی یادو داواکەی تێدابوو، ئەوە ئەگەر خوا بیەوێت هیچ ئاسەواری گوناهی بەسەرەوە نامێنێت.

## التهلیل (لا إله إلا الله)

بە داوای لێخۆشبوون (الإستغفار) بڕواداری گوناهبار دەگەڕێتەوە بۆ لای خواو وازدەهێنێت لە هەموو پەرستراوەکانی تر -کە حەزو ئارەزووی خۆی یەکێکە لەوانە-جا گەڕانەوەی ئەم ئیماندارە بۆلای خوای تاک وتەنیا، وا پێویست دەکات هەموو بوارەکانی ژیانی بگرێتەوە'، ئەمەیە واتای بەندایەتی خوا، لێرەشەوە پێویستی دووبارەکردنەوەی (لا إله إلا الله) دەردەکەوێت کە لەواتاکەیدا هەموو جۆرە خوایەتییەک جگە لە خوایگەورە وەلا دەنێت و خۆدانە دەست یەک خوای تاک و تەنها دەسەلمێنێت.

( لاإله إلا الله) واتە: هیچ فەرمانڕەواو فریادڕەسێک نییە جگەلە أ لله

خۆزگە کە کەسێک دەبینین -لەوانەی کە هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دەکەین- ریابازیی دەکات و حەزو ئارەزووی خۆی دەپەرستێت و دەیکات بە هاوبەشی لە گوێڕایەڵیو پەرستندا،

ئاگادارمان بکردایەتەوە کە کـاری مـرۆڤ بەریابازییـەوە وەرناگرێـت و دەدرێتـەوە بـەناوچاویا. هەموو کارێکی دینداری و هەموو پەرستشێک دەبێ هەر بۆ خواو لەبەرخوا بکرێت، چونکە تەنها هەر ئەو پەرستراوی راستەقینەیەو هیچ هاوبەشێکی نیە. هەروەها پێی بڵێـین: ئایـا نـازانیت کـە هاوبەشت بۆ خوا داناوە لە فلان کاردا -حەزو ئارەزووی خۆت یا خەکی ترت کردووە بە هاوەبشـی خوا لە کارەکانتا- جا دوای ئەوەو بـۆ چارەی ئـەو دەردەی پێـی بڵێـین دەبێـت لـە شـەوو ڕۆژدا ئەوەندە جار (لاإله إلا الله) بخوێنێت. ژمارەی جارەکانیش بە گوێرەی حـاڵی ئـەو کەسـە لەلایـەن پەروەرشـکارەوە دیـاریدەکرێت، دوای تێگەیشـتنیلە واتـاو مەبەسـتی ویردەکـە ئـەوەش روون بکرێتەوە کە هەموو کارێک کە بۆ خوا ئەنجام دەدرێـت دەبێت دڵسۆزی (الإخـلاص)ی تێدابێـت ئەگینا وەرناگیرێـت و دەدرێـتەوە بەسەری خاوەنەکەیدا، ئەمەش یەکێکە لە مەبەستەکانی (لاإلـه إلا الله).

### سلاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ

کاتێک ئیماندار بەداواکردنی لێخۆشبوون لە خـوا وازی لـە هـەموو -بـەناو- خواکـان هێنـاو چووە گۆڕەپانی بەندایەتی دڵسۆزانە بـۆ خـوای تـاک وتـەنها، بـە تێگەیشـتن و دان نـان بەوتـەی دڵسۆزی (الإخلاص)دا بەندایەتی بوو بە خسڵەت بۆی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، ئەو کاتە ئەبێ بیربکاتـەوە کەچۆن هاتووەتە ناو ئەم گۆڕەپانەو، بـەهۆی کـێوە خـوای گـەورە لای لێکردۆتـەوەو، ڕێزی لێگرتووەو، ئەم ئایینەی بۆ ناردووەو ، بووە بە بەندەی خوای گـەورەو، لەدەسـت هـەموو - بەناو- خواکانی دنیا رزگاری بووە؟ ئـەبێ بزانێـت بـەهۆی هـەوڵ وتێکۆشـانی پێغەمبـەرەوە ﷺ ئەبوایە ئیمانداران نەدەگەیشتنە پلەو پایەی بەندایەتی بـۆ خـوای گـەورە. کەواتـە پێغەمبـەر ﷺ چاکەو منەتی زۆرە بەسـەر ئیمانداراندـەوە -جـودا لـە هـەموو نیعمەتـەکانی تـری خـوا- چونکـە پێغەمبەر ﷺ بەفەرمانی خوا هۆ بوو بۆ ئەوەی کـە ئـەو نیعمەتـە گەورەیـەمان دەسـکەوێت کـە ئەویش نیعمەتی رێی هیدایەت و ئیمانە، لەبەر ئەمە دەبێ سوپاسی بکەینو ڕێزی لێبگرین، وەک گوتراویشە هە رکەسێک سوپاسی خەڵک نەکات سوپاسی خوایش ناکات.

جا بەر لەوەی دەربڕینێکی گونجاوو شیاو بۆ سلاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ دیاری بکـەین، کە خۆی بۆ خۆی فێری کردووین، ئەبێ ئەوەشمان لەیادبێـت کـە کەسـانێکی تریـش هـە رچاکـەو منەتیان بەسەرمانەوەهەیە لە گەیاندنی ئایین و بەرنامەی خوادا پێمان کە ئـەوانیش بریتین لـە (ئـاڵ)ی پێغەمبـەر ﷺ ، ئەگـەر بـەهۆی هـەوڵ و تێکۆشـانی ئەوانـەوە نەبوایـە، ئـەم ئایینـە نەدەگەیشت بەئێمە، لە ڕاستیدا مانای زۆر لە (آل) کـراوە، بـەلام راستتر وایـە کـەبڵێین (آل) یارە پێشینەکان و شوێن کەوتوانیانن، (السـابقون الأولـون مـن المهاجرين والأنصـار والذين اتبعوهـم بإحسان) واتە: پێشینانی یەکەم لە کۆچکەران و یاریدەدەران و ئەوانەی بە جوانی و چاکی شوێنیان کەوتن.

ئەوەتـە پێغەمبـەر ﷺ خـۆی تێکۆشـان و گرنگییـان هەڵدەسـەنگێنێت و لـەکاتی گەرمـەی جەنگی بەدردا دەفەرموێت: ( اللهم إن تهلك هـذه العصابة فلن تعبد في الأرض) واتـە: ئـەی خـوای گەورە ئەگەر ئەم تاقمە تیابچێت ئەوە ئیتر لەسەرزەویدا ناپەرسترێیت.

بەڵێ ئەمە شتێکی سەرسـوڕهێنەر نییـە، خـوای گـەورە ویستی وایـە کـە هـەموو شتێک

هۆکاری ببێت و، لەهەموو سەردەمێکدا گەیاندنی ئاینی خوای داوە بەسەر شانی پیاوانی چاک دا کە بیگەیەننە دەست دوای خۆیان. کەواتە ئەگەر لەهەموو قۆناغەکانی مێژووی ئەم ئوممەتەدا تا ئەم سەردەمە شوێنکەوتوانی پێغەمبەر ﷺ نەبوونایە ئێمە دوور دەبووین لەو نیعمەتە گەورەیە. بۆیە واجبە لەسەر ئیمانداران وەفای خۆیانیان بۆ دەبڕن و لە خوای گەورە بپاڕێنەوەو داوای لێبکەن کە چی شیاوە بۆیان پێیان بدات.

ئەو دەربڕینە گونجاوەش کە پێغەمبەر ﷺ خۆی دیاری کردووەو داوای لە ئیمانداران کردووە کە هەر ئەوە بەکاربهێنن ئەوەیە کە دەفەرموێت: (أللهم صل على محمد وعلى آل محمد).

الصلاة: واتە: پاڕانەوەو داواکردنی نیعمەتێک کەبەخشینی نیشانەی ڕێزو پلەو پایەی بەرزی پێبەخشراوەکەیە، جا کە دەڵێین : (أللهم صل على محمد وعلى آل محمد ) واتە: خوایە ئەو نیعمەتانە بڕێژە بەسەر محمد دا کە پلەو پایەو گەورەیی بۆ سەوگەر دەکەن، هەروەها بەسەر شوێن کەوتوانیشیدا هەریەکە بەگوێرەی پلەوپایەیخۆی (كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد) هەروەک چۆن نیعمەتت ڕشت بەسەر ئیبراهیم و شوێنکەوتوانی ئیبراهیم دا، خوایە تۆ سوپاسکراوو ڕێزلێگیراویت ( وبارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على آل إبراهيم إنك حميد مجيد) وەئەونیعمەتە زۆرو بەردەوام بکە بەسەر محمدو شوێنکەوتوانیدا، هەروەک چۆن زۆرو بەردەوامت کرد بەسەر شوێنکەوتوانی ئیبراهیمدا، تۆ سوپاسکراوو ڕێزلێ گیراویت.

البركة: زۆرو بەردەوام کردنی نیعمەتەکان .

ئەم داڕشتن و دەربڕینە وبەهێزترین و ڕاستترین سلاواتە کە لەپێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاوەتەوە. وە هەموودەزانین کە سلاوات جۆرێکە لە پەرستش (عبادة) کەواتە پێویستە ئەو داڕشتن و دەقە بخوێنین کەپێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێداوین کەبیخوێنین.

بەم جۆرە دەبینین پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ چاکەو منەتی زۆری هەیە بەسەر مرۆڤی ئیماندارەوە، بەڕاستی گەورەترین منەت و چاکە، منەتی نیعمەتی ئایینی پەروەردگارە، لەبەرئەمە ئەبێ بڕوادار ڕێزی لێبگرێت و پلەو پایەی بەگەورە سەیرکات و، ئەمەکداری و سوپاسی خۆی بۆ دەربڕێت، یەکێک لەئەرکەکانیئێمەی بانگخوازی ڕێگەی خوا ئەوەیە کاتێک کە دەبینین کەسێک بێئاگایە لە ڕێزی پێغەمبەر ﷺ و نازانێت چەندێک چاکەو منەتی بەسەریەوە هەیە، دەگونجێ سلاواتی لەسەر بدات بەلام واتاو مەبەستی سلاواتەکە نازانێت وهیچ کاری تێناکات و ئاسەوار لەسەری دانانێت، ئاگاداری بکەینەوەو بۆی باس بکەین کەپێغەمبەر ﷺ زۆر چاکەو منەتی بەسەرمانەوە هەیەو، واتاو مەبەستی سلاواتی بۆ ڕوون بکەینەوە.

بەم جۆرە بینیمان مرۆڤی ئیماندار بەداوای لێخۆشبوون (الإستغفار) باری دەروونیی ئامادە دەبێت بۆ نزیک بوونەوە لە خوای گەورەو، بە (لا إله إلا الله) ملی ڕێگەی بەندایەتی دەگرێت و بە سلاواتدان لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئەرک وئەمەکداریو سوپاسی خۆی بەجێدێنێت بەرامبەر پێغەمبەر ﷺ و شوێنکەوتوانی.

لە کۆتاییدا داوای لێخۆشبوون لە خوای گەورە دەکەین و، داواکارین لە ڕیزی دەستەی دڵسۆزەکاندا بمانژمێرێت . آمین

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

# چاکسازی

دوژمنایەتیو رق و کینە، دەردێکی زۆر کوشندەیە دەبێتە هۆی تێکدانی باری کۆمەڵگاو شارستانیەت، سەرەڕای ئەوەی دەبێتە خۆرەی کردەوە چاکەکان و بڕواو ئایین لەناو دەبات، لێرەدا گرنگی چاکەکردن و پلەو پایەی چاکەخوازانمان بۆ دەردەکەوێت

بۆ ئەوەی رەحمەت و بەزەیی خوای باڵادەست، مسۆگەر بکەین پێویستە چاکەخوازبین، بۆ ئەو مەبەستەش پێویستە بزانین:

**چاکەکردن چیە ؟**

**لەبەرچی چاکەخوازبین ؟**

**دەبێت چاکەخوازان چۆن هەنگاو بنێن ؟**

**سیفاتی چاکەخوازان کامەیە ؟**

**پێشەکی**

لە زاراوەدا چاکەکردن بەمانای دژ بە (فەساد)و خراپەکارییە، لە زارەوەشدا بریتییە لە ویستی چاکەو رێک کردنی لاریی.

لێرەدا چەند خاڵێک هەیە پێویستە بزانرێن :

١- پێغەمبەران و شوێنکەوتوەکانیان چاکەکاری راستەقینەن، خوای گەورە لەسەر زمانی حەزرەتی (شعیب) دەفەرموێت: ( إن أريد إلا الإصلاح مااستطعت وما توفيقي إلا با لله ) هود/٨٨

واتە: من تەنها چاکەکردنم دەوێت -چەندەی بتوانم- سەرکەوتنی منیش تەنها بەدەست خوایە.

٢- ئەو کارو کردەوانەی کە چاکەکاران دەیکەن، پێویستە تەنها مەبەستیان رەزامەندی خوای گەورەبێت و، لەو پێناوەشدا بەرگەی ئەو ئازارو ئەشکەنجانە بگرن کە تووشیان دێت، دەبێت خۆڕاگربن و کۆڵ نەدەن، پێغەمبەری ئازیز ﷺ بکەن بە سەرمەشق بۆ خۆیان، ئەوەبوو ئەو پێغەمبەرە بەرێزە ﷺ بەچەندەها جۆر ئازاریان دەدا، وەک بەردباران کردن و گەمارۆدان و گاڵتەپێکردن و هەوڵدان بۆ کوشتن، بەڵام ئەو هەر سووربوو لەسەر ئەو رێبازە چاکەکارییەی کە گرتبویە بەر

( وإذ يمكر بك الذين كفروا ليثبتوك أو يقتلوك أو يخرجوك ويمكرون ويمكر ا لله وا لله خير الماكرين ) الأنفال/٣٠.

٣- چاکەکاری تەنها بە قسەو خۆهەڵکێشان نابێت بەڵکو کردەوە مەرجی سەرەکییە، لەبەر ئەمە چاکەکار لەناو کۆمەڵدا زوو دەردەکەوێت چونکە خراپەکاران خۆیان بەخراپەکار نادەن لەقەڵەم، بگرە خۆیان بە چاکەخواز دەزانن. بەڵام کردەوەکانیان دەری دەخات کە ئاشوب گێڕو خراپەکارن.

( وإذا قيل لهم لاتفسدوا في الأرض قالوا إنما نحن مصلحون ألا إنهم هم المفسدون ولكن لا يشعرون) البقرة/١٢

واتە: گەر پێیان بوترێ خراپەکاری لە زەویدا مەکەن، دەڵێن ئێمە چاکەکارین، بەڕاستی ئەوانە خراپەکارن بەڵام هەستی پێناکەن

٤- خراپەکاری و فساد، چەند جۆرێکن، پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی بۆ هەندێکیان کردووە کە هاتوونەتەدی:

ا- کوشت و کوشتارو بێڕێزی ئادەمیزاد پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ڕۆژیدوایی نایەت هەتا وای لێدێت کە پیاو براکەی خۆی دەکوژێت و نازانێت لەبەرچی کوشتویەتی) حاکم گێڕاویەتیەوە

ب- پشێوی و تێکچوونی باری رامیاری و فەرمانڕەوایی:

ئەمەش بەهۆی گرتنە دەستی جڵەوی دەسەڵات لەلایەن کسانی ناشایستەوە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ئەگەر ئەمانەت ون کرا چاوەڕوانی قیامەت بن.. پرسیار کرا: ون کردنی ئەمانەت چۆنە؟ فەرمووی: هەرکاتێک کار سپێردرا بەکەسێک کە شیاوی نەبوو، ئەوا چاوەڕوانی قیامەت بکەن!. بوخاری گێڕاویەتیەوە.

ج- پەتیارەیی و بێڕەوشتی و بڵاوبوونەوەی رەوشتی ناشیرین و نامۆ بە کۆمەڵگای ئیسلامیی و بەرەو جیهانی ئاژەڵ چوون.

د- مەیخواردنەوەو بەکارهێنانی ماددە سڕکەرەکان :

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( کۆمەڵێ لە ئوممەتی من مەی دەخۆنەوەو ناوی تری لێ دەنێن، لە ژوور سەریانەوە گۆرانی دەوترێت و ئەغمەو سوڕدان دەکرێت. ئەوانە خوایگەورە دەیانبات بەناخی زەویداو دەیانگۆڕێت بە مەیمون و بەراز ) رواه ابن ماجة والبيهقي وابن عساكر وصححه الألباني، رقم الحديث/٩٠.

هـ- بەرەڵڵایی و بێڕێزی لەنێو کۆمەڵدا وەک بە سووک تەماشاکردنی باوک و دایک، دڵ ئێشانیان و پشت هەڵکردن لێیان.. هەروەها بڵاوبوونەوەی خیانەت و ناپاکی دەبێتە شتێکی ئاسایی و مرۆڤی دەست پاک کەم دەست دەکەوێت.

## چاکەکردن بۆچی ؟

١- هەتا خەڵکی بە شکۆمەندی و سەربەرزی بژین و دڵنیابن لە ئاین و ماڵ و ناموسیان.. ئاسودەو تەباو هاوکارو برای یەکتر بن .

چونکە ئەو پەیوەندییە ئیمانییەی کە لەنێوان عەبدەکان و پەروەردگاریاندا دروست دەبێت بەهێزترین پەیوەندییەو پاڵپێوەنەرو زامنی هەموو چاکەکارییەکە.

بەردەوام بوونی ئەو حاڵەتەش پەیوەستە بەئەندازەی ئەو لەخواترسان و نزیک بوونەوەیە لێی، هەربۆیە خوایگەورە دەفەرموێ: ( إن الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون) النحل/١٢٨

کەواتە ئەو چاکەکارییە بەردەوام و بێمەرامە کە لەدڵ و دەروونی کسێکی پارێزکارو لەخواترسەوە سەرچاوەی گرتبێ.

٢- چاکەکردن پێویستە هەتا گەل و وولات پارێزراو بێ لە خەشم و تووڕەیی خوا

لە راستیدا پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لە نێوان بیروباوەڕی خەڵکی و خۆشگوزەرانیدا، ئەگەر خەڵکی بڕواداربن و چاکەخوازبن ئەوا خوای گەورە دەرگای بەزەیییان لێدەکاتەوە، وە

بەپێچەوانەوە ئەگەر خراپەکار بن، ئاسایشیان لێ هەڵدەگیرێت و تووشی ترس و برسییەتیو بێئارامی دەبن

چونکە پیاوچاکان و چاکەکاران، مایەی سەربەرزی نەتەوەن و هەر ئەوانیش لەنگەری هۆزو نەتەوە رادەگرن و بەهۆی ئەوانەوەیە کە پشێوی (فوضى) روونادات و وڵات و خەڵکی هەردەم دەستەو نزان بۆیان. ئەگەر ئەوان نەبن کێ لا لە هەژاران و نەداران و داماوان بکاتەوە؟!

لەسەردەمی پێشەوا (عومەر) لە مەدینە بوومەلەرزەیەک رووی دا، ئەویش خەڵکەکەی کۆ کردەوەو پێی وتن ئەمەی روویداوە، بەهۆی گوناهەوە بووە. سوێندبێ بەخوا ئەگەر جارێکیتر رووبدات، ناهێڵم لێرە نیشتەجێ ببن . (الجواب الكافي ل٤٦) .

خوای گەورە دەفەرموێت: ( وما كان ربك مهلك القرى بظلم وأهلها مصلحون) هود/١١. واتە: پەروەردگار هیچ شارو شارۆچکەیەک لەناو نابات، لەکاتێکدا دانیشتوانی چاکەخوازبن.

## کاری چاکە چییەو کێ چاک دەکەن ؟

چاکەکاران کارەکەیان گەلێ گران و پیرۆزە، چونکە کاری پێغەمبەرانە، بۆیە پێویستە ئەم لایەنانە بگرنەخۆ:

یەکەم/ راستکردنەوەی بیروباوەڕو بنەما بنچینەییەکان لای موسڵمانان ئەمەش بەپەروەردەکردنیان لەسەر

أ- دان نان بە تاک و تەنیایی خوا لەپەروەردگاریتیو پەرستندا

پێویستە موسڵمان، دڵی یەکلاو بێگومان بێت و بەتەواوەتی باوەڕی جێگیرو دامەزراوبێت لەسەر ئەوەی کە(اللە) پەروەدگاری هەموو شتێکەو جگە لەو هیچ پەروەردگارێکی تر نیەو هەر ئەویش شایەنی پەرستن و بەندایەتی بۆکردنە.

ب- دوورکەوتنەوە لەهەموو شێوەکانی (شرک)و هاوەڵدانان.

دووهەم / راستکردنەوەی تێگەیشتن و ئەو چەمکە فیکریانەی کە لەنەتەوەی موسڵمان شێوێنراوە، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە بزانین کە:

أ - بەرنامەی ئیسلام هەردوو چەمکی بیروباوەڕو شەریعەتی بەیەکەوە گرێداوە، لەچەمکی یەکەمدا بڕوا بە خواو بەپەیامبەران و زیندووبوونەوە باس دەکات، وە لە چەمکی دووەمدا هەرچی باسی بەندایەتیو مامەڵەو ئاداب و یاساکانی (ئەحوال شەخسی)و پەیوەندی نێودەوڵەتییە هەیە دەیگرێتە خۆ .

ئایینی ئیسلام ئایین و دەوڵەتە، بیروباوەڕو یاسایە، بەرنامەیەکی هەمەلایەنەو گشتگیرە پێویستە ئەمە لە دەروونی موسڵماندا جێگیر ببێت و لەکردەوەکانیدا رەنگ بداتەوە.

دەبێت لەناخی موسڵماندا ئەوە جێگیربێت کە (تەنها ئیسلام چارەسەری هەموو کێشە ئاڵۆزەکانی مرۆڤایەتی پێیەو لەبەردەمیاندا دەستەوسان ناوەستێت).

ب/ پێویستە موسڵمان ئاگاداربکرێ لە فرت و فێڵی دوژمنانیان، ئەوانەی کە بەئاشکراو نهێنی پیلان دادەنێن بۆ ناشیرین کردنی رواڵەتی موسڵمانان .

دەبێت ئەوەش بزانین هەندێ لەو ناحەزانە بە زمان و قاڵەی ئیعلامی لافی بڕواداری لێدەدەن و بەڵام لەناخیاندا بەپێچەوانەوە زۆر دوورن لە حەقیقەتی ئیسلامەوە، هەروەها پێویستە

لە مانای خۆشەویستی‌و (ولاء) حاڵی ببین کە نابێت بێجگە لە خواو پێغەمبەرو موسڵمانان خۆشەویستی‌مان بۆ کەسی‌تر هەبێت و کۆمەکی بکەین، خوای گەورە دەفەرموێت: (لاتجد قوما یؤمنون با لله والیوم الآخر یوادون من حاد ا لله ورسوله ولو كان آباءهم أو أبناءهم أو إخوانهم أو عشیرتهم) المجادلة/٢٢.

عەبدوڵڵای کوڕی مسعود -رەزای خوای لێ‌بێت-دەفەرموێت: ( سوێند بێت بە خوا ئەگەر پیاوێک حەفتاساڵ لەنێوان کەعبەو منبەری پێغەمبەردا ﷺ خواپەرستی بکات، دەبێت رۆژی قیامەت لەگەڵ ئەو کەسەدا بێت کە خۆشی ویستووە لە دنیادا.

سێ‌هەم/ چاککردنی دڵ و دەروونی موسڵمانان و ناشتنی رەوشتی جوان لە دڵەکانیاندا، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ( إن ا لله لا ینظر إلی صورکم ولا إلی أجسامكم ولكن ینظر إلی مافي قلوبكم وأعمالكم) مسلم گێراویەتیەوە.

واتە: خوای گەورە تەماشای دیمەن و لاشەتان ناکات، بەڵکو سەیری دڵ و کردەوەتان دەکات.

ئەم چاککردنەوەش بەوەدەبێت کە :

أ - دڵان پاک بکەینەوە لە رق و کینەو چاوبرسیەتی ئیرەیی (الحسادة) و حەزی تۆڵەسەندن و خۆبەزل زانین و لەخۆ بایی بوون .

ب - دەبێت موسڵمان خاوەنی کەسایەتی‌یەکی بەهێزو دامەزراوی سەربەخۆ بێت و گوفتارو کرداری لەیەک بچن بۆ نموونە لەناوماڵ و منداڵیداو لە کارو فرمانیداو لەکاتی بەندایەتی کردنیدا دەبێ هەمان کەسایەتی هەبێت، نەک بەگوێرەی شوێن، و بۆنەکان بگۆڕێت، خوای گەورە ئەو جۆرە هەڵس و کەوتەی بەخیانەت ناوبردووە وەک دەفەرموێت:

( یاأیها الذین آمنوا لاتخونوا ا لله والرسول وتخونوا أماناتكم وأنتم تعلمون) الأنفال/٢٧.

عوروەی کوڕی زوبێر دەڵێت: دووڕوویی لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ نیشان مەدەن، کاتێک چوونە لای ، خۆتان بەپیاوچاک بدەن لەقەڵەم، بەڵام لە پاشەملە رەفتاریان بەپێچەوانەی فەرمایشتەکانیەوە بێت. ئەم کارە بەراستی لەناوتان دەبات، چونکە لە فەرموودەدا هاتووە کەلە رۆژی قیامەت دا ، کۆمەڵێک دێن بەخۆیان و کردەوەی چاکەی زۆرەوە کە بەئەندازەی کەژی (توهامە)یەو بەرزو سپی‌یە بەڵام خوای گەورە دەیکات بە خاشاک و تۆز؟

ئەوانە برای ئێوەن، وەک ئێوەبەندایەتی‌و شەونوێژ دەکەن، بەڵام ئەوان سڵیان نەکردەوە لە شکاندنی سنوورەکانی خوای گەورە لەکاتی نهێنی‌دا. ابن ماجه گێراویەتیەوە .

## خەسڵەتەکانی پیاوچاکان کامانەن ؟

کۆمەڵێک رەوشت هەن پێویستن بۆ پیاوچاکان لەوانە:

١- دڵسۆزی-الإخلاص- لە هەموو قسەو کردارێکدا بەبێ‌گوێدانە سوپاس و ستایش کردن. جا ئەگەر دڵسۆزی لە کاردا نەبوو ئەوا ئەو کارو کردەوانە بۆ خوا نابێت بەڵکو بانگەشەیەکە بۆ مرۆڤەکان ئەوانەی خۆیان بە (پیرۆز) دەزانن و بەهیچ شێوەیەک رازی نابن رەخنەیان لێ بگیرێت یان راست بکرێتەوە.

هەزار ڕەحمەت لە پێشەوا عومەر بێت کاتێک پیاوێک لە ڕوویا هەستاو وتی: لەخوا بترسە ئەی گەورەی موسڵمانان! یەکێک لە دانیشتوان وتی: چۆن لە ڕووی گەورەی موسڵماناندا دەوەستی؟ پێشەوا عومەر فەرمووی: وازی لێ بێنن! سوێند بێت بە خوا ئەگەر وانەڵێن خێرتان تیا نییە، وە ئێمە دەبێت قبوڵی بکەین. ئەگەر نەیکەین خێریش لە ئێمەدا نییە! جا دەبێت مرۆڤی موسڵمان بەو شێوەیە دڵ فراوان بێت و ئامادەبێت بۆ هەموو ڕەخنەیەکی بەجێ .

٢- هاوکاری لە نێوان چاکەخوازان دا.. خوای گەورە لەچەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزدا داوای هاوکاری دەکات لەنێوان موسڵماناندا و فەرمانی پێ دەدات.

وە باسی دوژمنان دەکات بەوەی کە چۆن پاڵپشتی یەکترن (والذين كفروا بعضهم أولياء بعض إلا تفعلوه تكن فتنة في الأرض وفساد كبير) الأنفال/٨٣. جا دەبێت چی فیتنەیەک لەوە گەورەتر بێت کە پیاوچاکان پێویستییان بە کەسانی تر بێت بۆ ڕێنموییو پەروەردەکردنیان ؟!

زۆر پێویستە لەسەر چاکەکاران ئەوە بزانن کە دروستکردنی کەسایەتی موسڵمان تەواو نابێت بەبێ تۆکمەکردنی لایەنی فیکریو سیاسیەکەی .

بەتەنها گرنگیدان بەلایەنێک، بونیادی کەسایەتی موسڵمان تووشی لاوازییو داخوران دەبێت و ئەوکاتە زەرەری لە قازانجی زیاتر دەبێت. بەم شێوەیە دەرکەوت چاکەکاران زۆر پێویستیان بەیەکتر هەیە کە پاڵپشتی یەک بن و دەرگای گفتوگۆ لە ڕووی یەکتردا واڵابکەن .

وەدەبێ بزانین بەبێ ئەو هاوکارییە، بێداری ئیسلامیی هەرگیز گەشە ناکات و بەرەو پێش ناچێت ، ئەم مەیدانەش سەنگی مەحەکەو دڵسۆزان و تێکۆشەران بەمە تاقی دەکرێنەوە، خۆنەویستن و پەرۆشی بۆ ئایینی خوا لەم بوارەدا دەردەکەوێت. لە کۆتاییدا هیواداریین کە هەردەم کاری چاک بکەین و خوای گەورەش لەگەڵ چاکەکاراندا کۆمان بکاتەوە. امین

## ڕوونکردنەوەیەک دەربارەی

# زنجیرەی پەروەردە و پێگەیاندن

(زنجیرەی پەروەردە و پێگەیاندن) پرۆژەیەکی (پەروەردەیی، زانستی، سیاسی)یە، لە ڕەحمی هێزۆیەکی بەرلە ئەزموونێدا نەش و نمای کردووەو سەرەتای سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ (١٥) ساڵ لەمەوپێش، کە ژمارەیەک کەسایەتیی پسپۆڕ و مامۆستای لێزان و خەمخۆر، کەوتنە بیری دانانی بەرنامەو پرۆگرامێکی پەروەردەیی، بۆ پێگەیاندنی تاکی موسڵمان لە هەرسێ لایەنی (فیکری)و (دەروونی)و (جەستەیی)یەوە.. دواتر پرۆژەکە لە سەردەمانی جیاجیادا بەپێی خواستی کات و جۆری قۆناغەکان، ئاڵوگۆڕو زیادو کەمیی تیاکراوە. لەم زنجیرەیەدا هەوڵدراوە کە بەرنامەیەکی گشتگیرو هەمەلایەنە لەم سێ ڕەهەندەی سەرەوە بخرێتە بەر دەستی پەروەرشیاران.

پرۆژەکە بۆ پێنج قۆناغی پێگەیاندن دانراوەو هەر قۆناغەش ئەو سێ بەشەی سەرەوەی لێ دەبێتەوە، بۆ ئەوەی پێکهاتەی کەسایەتیی مرۆڤ (هزرو دەروون و ڕەفتار)ی هەمووی بگرێتەوە، تەنها تەرخان نەبێ بۆ لایەنێک. بۆ هەر بەشەو هەر قۆناغەش مەبەستی تایبەت و خشتەو لانیحەی تایبەت گەڵاڵە کراون، تا یارمەتیدەری پەروەرشیارو بانگخوازان بێت لە جێبەجێ کردنی بەش و قۆناغە جیاجیاکانی پرۆژەکەدا.

هیواداریین پرۆژەکە ئەرزنمی بێت لە بواری پەروەردەکردندا و مایەی ڕەزامەندیی خوای میهرەبان و، جێی سوودمەندیی پەروەرشیاران بێت.

سلسلة التربية والأعداد

المرحلة الأولى

- ١ -

# تزكية النفس

اعداد : لجنة متخصصة

الطبعة الأولى

١٤١٨ك - ١٩٩٧ز

له چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە چاپ کراوە